# تاوانە گەورەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

نووسین و ئامادەکردنی

عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز

له بلاوكراوهكانی ئهمیندارێتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان

# تاوانه گهورهكان له ڕوانگهی ئیسلامهوه

نوسینی و ئامادهكردنی

**عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز**

ئیمامی گوندی دارتوو

١٩٨٩

# پێشەکی

## بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

پێشەکی هۆی دانانی ئەم نووسینەم چی بوو ؟

رۆژێ لەرۆژان لە ژورەکـەمدا راکشابوم خەریکی خوێـنـدنـەوە بووم کاتـێـك سەرم هەڵ بڕیو چاوم بە کتێبخـانـەکەم دا خشاندو ماوەیەك لێی وورد بوومەوەو سەیرم کرد سوپاس بۆ خوا گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە هەموو جۆرە پەرتوکێکی ئاینی تێدابوو بۆ نموونە گەلێك لە تەفسیری قورعان و شەریعەت و فقەو پەرتووکی فەرمودەو ژیانی پێغەبەر دروودی خوای لێ بێ لێرەدا لەبەر خۆمەوە گوتم بۆچی خزمەتێکی ئایینەکەت ناکەیت هەروەك زۆر لە زانا ئاینی یەکانمان خزمەتی ئەم ئاینە بیرۆزەیان کردووە پەرتـووکیـان داناوە خوا پاداشتی چاکەی هەموو لایەك بداتەوە لەبەر ئەوە منیش دەستم کرد بە کۆکردنەوە هەندێك

[ بسم الله الرحمن الرحيم ]

الحمد لله الذي هو الاول والاخر والباطن والظاهر الذي هو بكل شئ عليم والصلاة والسلام على إمام المتقين وخاتم الانبياء والمرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

خوای مەزن لە قورئاندا دەفەرمووی «إن تجتنبوا كبائر ما تنهون عنه نكفر عنكم سيئاتكم» واتە ئەگەر دوور بکەونەوە و دوور بمێنن لە تاوانە گەورەکان کەخوا لە ئێوەی قەدەغە کردووە ئەوا ئێمە تاوانە بچوکەکانی تریان دادە پۆشین بە بەزەیی و میهرەبانی خۆمان لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرمووێ «وندخلكم مدخلا كريما» سورة النساء ٣١ واتە ئەتانخەینە شوێنێکی خاوەن رێزو حورمەت. کە بەهەشتە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت «الذين يجتنبون كبائر الاثم والفواحش إلا اللمم إن ربك واسع المغفرة» سورة النجم ئایەتی [٣٢] (واتا ئەو کەسانەی کە خۆیان دەپارێزن لە تاوانە گەورەکان وەکو هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن و...

کوشتاری بێ تاوان ودەست بەسەر داگرتنی ماڵی خەڵك و داوێن پیس تەنها ئەو کەسەی بە قەزاو قەدەر تاوانێکی لێ بقەومێ و بە مەرجێ بۆ جاری دووەم نەگەڕێتەوە سەری ئەوا بێ گومان دەرگای بەخشینی بۆ ئەو کەسانە گوشادو فراوانە پێغەمبەری خودا (د.خ)

دەفەرمویت [الصلوات الخمس والجمعة الى الجمعة ورمضان الى رمضان مكفرات ما بينهُنّ إذا اجتنبت الكبائر] رواه مسلم [واتە نوێژە فەرزکان ڕۆژی پێنج جار لەهەینەوە هەتا دەگاتە هەینی وەلە ڕەمەزان هەتا دەگاتە ڕەمەزانێکی تر دەبنە ڕەش کەرەوە بۆ تاوانەکانی موسلمان ئەگەر نزیکی تاوانە گەورەکان نەبێتەوە].

س/ ئەگەر یەکێك پرسیار بکات دەربارەی تاوانە گەورەکان چەندن ؟

ج/ لەوەلامدا دەڵێین تاوانە گەورەکان زۆرن بەلام ئێمە وەلامی ئەم پرسیارە بە فەرموودەیەکی [ابن عباس] خوای لێ ڕازی بێت دەدەینەوە کە دەڵێت [وقد روى عن ابن عباس رض الله عنهما أنه سئل عن الكبائر أسبع هي ؟ فقال هي الى سبعين وفي رواية أخرى سبعمائة...] واتە لە ڕاستیدا ڕیوایەت کراوە لە عەبدلای کوری عەباس پرسیایان لێ کرد تاوانی گەورە هەر ئەم حەوتەیە ؟ فەرمووی هەتا حەفتاشە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ حەوت سەدە ...[1] ئێمەش خودا یاریدەدەر بێت لە دووبەرگدا

(١) بڕوانە ((کتێبی)) الخطايا في نظر الاسلام لاپەرە ١٣ عفیف عبدالفتاح طبارة وە پەرتوکی (الكبائر) لاپەرە ٧ نوسینی شمس الدين، عبدالله محمد بن احمد الذهبي:

حەفتا بەشی [ تاوانەکان ] دەنوسین لەبەرگی یەکەم (بیست) تاوانی گەورە دەنوسین لەبەرگی دووەمیش ئەوانی تر تەواو دەکەین لەسەر رێك خستن و شێوەی پەرتووکی [الکبائر] نوسینی بەرێز [شێخ شمس الدین ابي عبدالله] ئەگەر خوا [حەزکات].

بەڵام ئێمە بەکورتی لەسەری دەڕۆین وەکەمتەرخەمی ناکەین لەوەرگێڕان و نووسینەوەی (احکامەکان) بەقەدر توانا هەروەك گوتراوە (مالا یدرك کله لا یترك کله).

ئینجا خوێنەرە بەرێزەکان (ماموستا مەلا عبدالکریمی مدرس) لە تەفسیرەکەیدا بەناوی (نامی) باسێکی زۆر گرنگی رون کردۆتەوە لەباری تاوانە گەورەکانەوە وەمنیش بە پێویستم زانی ئاژمارەی بۆ بکەم بیخەمە پێش چاو،کە دەفەرموێ بزانن لەسەر زاهیری قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت گوناهو تاوان بریتین لەو نافەرمانانەی کە بەسەر ئادەمیزاد دێن لە تاوانی گەورەو بچوك وە ئەو کەسانەی کە فەرموویانە تاوانی بچوك نیە مەبەستیان ئەوەیە ئەگەر ئێمە تەماشای گەورەیی خوا بکەین و تەماشای نرخی فەرمانی ئەو بکەین دەبێ هەموو نا فەرمانیەك بەگەورەو زیان بەخشی تەمەشا بکەین ژمارەی تاوانە گەورەکان حەوت سەد دەبن هەروەك ابن عباس دیاری کردووە بەڵام حەوت

لەوحـەوت سەدە بە [ئـەو تێیدەن] موبقات ناوبراون واتە تاوانبـارەکـە بە هـیـلاک دەبەن وەك فەرمویەتی حەزرەت (د.خ) (اجتنبـوا السبـع الموبقات الشراك با لّله والسحر وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق وأكل مال اليتيم وأكل الربـا والتـولى يوم الزحف وقـذف المحصنـات الغافلات المؤمنات) متفق عليه وە لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموویێت (الكبـائـر الاشراك با لّله والسحر وحقوق الوالدين وقتل النفس) وە ئیمامی بوخاری لەسەر ئەم ریوایەتە (اليمين الغموس)ی زیاد کردووە و ئیمامی موسلیم لە جیاتی ئەمە دەڵێت (قـول الزور) مەبەستمان لە باس کردنی ئەوانە ئەوەیـە کە ئەو تاوانـانە زیانیان یەکجار زۆرە بۆ بروای (ایمان) موسلمان ئەگەرنا تاوانی گەورە بە مانە تەواو نابن تەماشا بکەن (ئیبن و حەجەری) هەیتەمی لە زواجیردا لە (شیـخ الاسـلام) علائی دەگێریتەوە کە جەزمێکی رێك خستووە لە تاوانی گەورە کە بەشێکیان پێغەمبەر (د.خ) ناوی ناوە تاوانی گەورە ئەوانەش ئەمانەی خوارەوەن :

هاوبەشی دانان بۆ خودا،کوشتن،داوێن پیسی،راکردن لە شەری گاوراندا،سوو خواردنی مالی هەتیو،بوختان کردن بۆ ژنی خاوەن شوورەیی،جادوگـەری،زمان درێـژی لە نامـوسی موسلّمـاندا بە ناحەق،گەواهی (شهادة) درۆ لە دادگـا،ئاژاوە نانـەوە،دزی کردن،عەرەق خواردن،هەتکی

خانـەی خواو کەعبـەی پیرۆز،شکـانـدنی پیمـانی رەوا بەناحەق،واز هێنان لە سونەتی پێغەمبەر،دوور کەوتنەوە لە جەمـاعەت پاش کۆچ کردن،نائومێد بوون لەبەزەیی خوا دڵنیایی لەغەزەبی خوا،قەدەغە کردنی ڕێبوار لە ئاوی زیاد خۆپاك نەکردنەوە لەمیزو پاش میز،جۆێن دان و ئازار دانی دایك و باوك،گۆرینی وەسیەتی موسڵمانان،ئەمانە هەموو بە تاوانی گەورە دانـراون جا هەر وەکـوو روونمان کردەوە ژمارەی تاوانە گەورەکان زۆرن و بەئاسانی دیاری ناکرێن پێنـاسـەی ئەم جۆرە تاوانانە زۆرن و لەلایەن زاناکانەوە گەلێ پێنـاسـەی بۆ دانراوە کە زۆربەی زاناکانی تر پێی قایل نەبوونە بەڵێ (شیخ الاسلام بارزی) دەفەرمووێ بە راستی تاوانی گەورە ئەو تاوانـەیـە کە خودا قەدەغـەی کردووە لە موسڵمـانـان بە هەرەشـەیـەکی توندو بەهێز وەلەگـەڵ نەفـرەت و (لعنـة) کردن لەو کەسـەی پێی هەڵدەستی یا بە ئایـەت وە یاخود بەفەرمودەی حەزرەت (د.خ) چونکە تاوانی گەورە گەلێك شێوەی هەیە یەکەمیان تاوانی بێ کە پەیـوەندی بەخووی مرۆڤ خۆیەوە هەبێ وەکوو ڕیابازی وە لە خۆبایی بوون و خۆ بەگەورە زانین و حەسوودی و تەماشا کردنی خەڵك بەسووکی دووەم ئەو تاوانانەن کە بە ئاشکراو بە دەرەوەن و پەیوەندیان هەیە بەزیان گەیاندن بە خەڵکی لەناو دەروونیاندا وەکو کوشتنی بێ تاوان و دەسـت برین و سێهـەم ئەوەیـە کە زیـان

دەگەیەنێ بەناموسی خەڵك و بوختان هەڵبەستن بۆ بێ تاوان چوارەم ئەوەیە کەزیان دەگەیەنێ بە دارایی خەڵك کە لەبەر زۆری ناژمێر درێن پێنجەم ئەوەیە کە زیان بە دڵی خەڵك دەگەیەنێ وەك ئاژاوە نانەوە و قسە هێنان و بردن لە نێوان خەڵك داو قسە بردن بۆ لای فەرمانداران بۆزیان گەیاندو بەپلەو پایەی خەڵکی و (غەیبەت کردن) و جوێن دان و ناو بەد کردنی موسڵمانان و هەڵبەستی درۆو ناپاکی و دوو روویی بە دەمیانەوە وە وێنەی ئەم تاوانە زیان بەخشانەش کە دەبێتە هۆی نەمانی یەکێتی موسڵمانان و لەرزینی بناغەی دڵیان تێك دەدات[1]

**عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز**

---

(١)بروانە تەفسیری (نامی) بەرگی دووەم لاپەڕە (٣٠٢)

## تاوانی یەکەم

# هاوبەشی
# بۆ خودا پەیدا کردن

[الشرك باللە]

(اعاذنا الله منه بمنه وكرمه وجوده انا والمسلمين في عافية بلا محنة انه اكرم كريم وارحم رحيم) واتە (خوای گەورە بمان پارێزێت لە گەورەیی و میهرەبانی خۆی لەم بارانە گەورەیەدا و دەروونمان سوور بوات دەمانەو ئیمان خۆش بێت بەبێ ئازاری ناخۆشی هەروەها خودا دەستی رەحمەتی لە گشت کەس بڵاوبێ وەلە هەموو بەخشندەیەك بەخشندەترە (شیخ ابن الحجر) خودا لێ رازی بێت دەفەرموێت (ولما كان الكفر اعظم الذنوب) (كان احق بان يبسط الكلام عليه وعلى احكامه) (فنقول) قال الله تعالى (ان الله لا يغفر ان يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء) سورەتی نساء ئایەتی ١١٥ واتە (خودای گەورە خۆش نابێت لەو کەسانەی هاوبەش و هاوەڵ پەیدا دەکەن بۆ خودا وەهەرش ئەبێت لە تاوانی تاوانی کە تەنها لە تاوانی هاوبەش دروست کردن خۆش نابێت بەمنۆش ئەبێ ئەوەی ئەو ببەوێ) لە ئایەتێکی تر ئەفەرموێت [ان الشرك لظلم عظيم] سورەتی (لوقمان) ئایەتی ١٣ واتە (بە راستی

هاوبەش پەیدا کردن بۆ خودا ستەمێکی یەکجار گەورەیە)
هەروەها دەفەرموێت لە ئایەتێکی تردا [انه من یشرك بالله
فقد حرم الله علیه الجنة ومأواه النار][1] واته(ئەو کەسەی
هاوبەش بۆ خودا پەیدا دەکات ئەو کەسە لەبەزەیی خوا بێ
بەشە وەخودا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات بەڵکو بێ گومان
دۆزەخ و ئاگر جێگای دەبێ) وە لە پەرتووکی (الکبائر) دا
دەڵێت [فمن اشرك بالله ثم مات مشركاً فهو من اصحاب
النـار قطعاً] واته (هەر کەسی هاوەڵ و هاوبەش بۆ خودا
پەیدا بکات پاشان بمرێت بەکافری دەمرێت وە دەبێتە یەکێ
لە دانیشتوانی ئاگر هەتا سەر] وە دیسان ئەفەرموێت [خدا
ان من امن بالله ومات مؤمناً فهو من اصحاب الجنة وإن
عذب بالنار] واته (هەر کەسێ باوەری هەبێت بە یەزدان و
پاشان بە باوەرەوە بمرێت ئەوا دانیشتوی بەهەشتە ئەگەر
کەمێکیش بە ئاگری دۆزەخ سزا بدرێت) پێغەمبەر خوا
(د.خ) ئەفەرموێت [الا انبئکم بأکبر الکبائر قالها ثلاثاً

---

(١)سورەتی مائده ئایەتی (٧٢)

قالوا بلى يا رسول الله قال الاشراك بالله وحقوق الوالدين] (متفق عليه) واته ئاگادارتان بكەمەوە بە تاوانە گەورەكان كامانەن؟ سێ جار دووبارەی كردەوە گوتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەر خودا فەرمووی هاوبەش بۆ خودا پەیدا كردن و بێ فەرمانی دایك و باوك وە ئازاردانیان وە راوی ئەفەرموێت «كان متكئاً فجلس فقال الا وقول الزور فما زال يكررها حتى قلنا ليته سكت» (متفق عليه) واتا [پێغەمبەر (د.خ) پاڵی دابوەوە وە دانیشت پاشان گوتی (شاهیدی) واتە[ گەواهی بەدرۆ ئەوەندە ئەو قسەیەی دووبارە دەكردەوە تاكو گوتمان خۆزگە بێ دەنگ دەبوو] وەلە فەرمودەیەكی تردا دەفەرموێت [اجتنبوا السبع الموبقات] (اي المهلكات) قالوا يا رسول الله وماهن ؟ قال الشرك بالله ... الخ بوخاری ومسلم ریوایەتیان كردوە واتا [خۆتان بپارێزن لەحەوت تاوانی فەوتێنەر گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەم تاوانانە كامانەن؟ فەرمووی ئەوەیە هاوبەشی بۆ خودا پەیدا بكەیت ]هتد لە حەدیسێكی تردا حەزرەت (د.خ) ئەفەرموێت [اكبرُ الكبائر الاشراكُ بالله وقتل النفس وحقوق الوالدين وشهادة الزور] رواه البخاري واتە [هەرە گەورەترینی تاوان ئەوەیە كە هاوبەش بۆ خودا دروست بكەیت و كوشتنی بەناحەق و ئازاردان و بێ فەرمانی و بێ دڵی دایك و باوكەو گەواهی درۆیە] (ابي درواء خوای لێ رازی بێت دەڵێت [اوصاني خليلي (ص) ان

لا تشرك بالله شيئاً وإن قطعت وان حرقت ولا تترك د
مكتوبةً متعمداً فمن تركها متعمداً فقد برئت منه الذ ا
واتـه (پێغـەمبـەری خوا (ص) ئامۆژگاری کردم[1]

هاوبەش و هاوەڵ بۆ خودا پەیدا نەکەم ئەگەر پارچە پار
بکـەن یاخـود بشم سوتێنن وەفـەرمـووی واز لە نوێژە
فەرزەکـان نەهێنیت بە ئەنقـەست ئەگـەر وازت هێنـا
بەئـەنقەست ئەوا بێ گومان لە کۆمەڵی موسڵمانان دەردە

چیت) وە دەفـەرموێت (ولا تشرب الخمر فانها مفتاح كل شر) رواه ابن ماجه والبيهقي) واتە مەی مەخۆرەوە چونکە بەراستی مەی کلیلی دەرگای هەموو خراپەیەکە فەرمانی (حـوکم) شەرعی بەرامبـەر ئەم تاوانە چی‌یە؟ پێغەمبەر (د.خ) دەفـەرمـوی (من بدّلَ دينـه فاقتلوهُ) رواه احمد والبخـاری واتـە (کەسێك لە ئاینەکەی پاش گەز بووەوە و ریبـازی خۆی گۆری ئەوە باداشتی هەر کوشتنـە) ئەم فەرمانەش پێویستە دادگەرێکی ئیسلامی بیدات ئیمامی شافعی (خـوای رازی بێت) دەفـەرمووێ هەر کەسێ بێ باوەر بوو بە خودا لەملی بدەن بەشیر :

(١)اخرجه ابن ماجه والبيهقي.

[تێبینی] زانایانی ئایینی دەڵێن هەر کەسێ کافر بێت یانی باوەڕەی نەمێنی بەخوا واتە بێ بەری لە ئاینی ئیسلام هەموو کردەوە باشەکانی بەفیڕۆ دەروات وە ئیمامی شافعی (ر.خ) دەڵێت لەسەر پێشەوایانو جێگری پێشەوای موسڵمان پێویستە بە زووترین کات داوای پەشیمان بوونە وە لەیاخی بوونەکەی (مرتد) بکات سێ جار ئەگەر پەشیمان بۆوە ئەوا پەشیمانی یەکەی لێ وەردە گیرێ ئەگەنا دەکوژرێت بەڵام سوتاندن دروست نیە هەروەها پێویستە نەشۆردرێ و نوێژی مردووی لەسەر نەکرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان نەشاردرێتەوە[1].

---

(١)کتاب کفاية الاخيار ص ٣٧٧ ج اولْ .

## جۆرێك لە هاوبەشی بچوك

## (الشرك الاصغر)[1]

هاوبەشی بچوك جۆرێکە لە هاوبەشی پەیدا کردن بۆ خودا هاوبەشی بچوك بریتی لە روڵەت (الرياء) خوای پەروەردگار ئەفەرموێت لە سورەتی (الماعون) [الذين هم يراءون] واتە سزای دۆزەخ «ويل»[2] بۆ ئەوانەی کە رووپامایی ئەکەن لە ئایەتێکی تردا خوا ئەفەرموێت [فمن كان يرجوا لقاء ربه فليعمل عملاً صالحاً ولا يشرك بعبادة ربه احداً] سورەی الكهف ئایەتی ١١٠ ـ موفەسیرەکان ئەڵێن بەمانا روالەت لە کردارەکان ئەکەن دەقی ئایەتەکە ئەمەیە واتە هەر کەسێك بەهیوای گەیشتنە بەخودا با کاری چاکە بکات وەبە هیچ جۆرێك لە پەرستندا هاوبەش

---

(١)تکایە ئاگادار بن رێکخستن و دانانی تاوانەکان لەسەر رێکستنی پەرتووکی (الكبائر)ە لە نووسینی (شمس الدين الذهبي ئەروین.

(٢)ویل : چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ وە بەمانای وەی هاوار دێت.

بۆ خودا پەیدا نەکات خوا پەرستنەکەی تەنها بۆ ڕەزابونی خوا بێ وەڵێرەدا مەبەست لە خوا پەرستن نوێژو ڕۆژو نیە بەڵکو هەر کردەوەیەك بێت بەبێ ڕیایی بۆ خودای تاك و تەنهایی بکەی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت [ان اخوف ما أخاف عليكم الشرك الاصغر وهو الرياء] واتە لە هەموو شتێك زیاتر لێی بترسم لە بابەت ئێوەوە هاوبەشی پەیدا کردنی بچوك ڕیا کاریە لە حەدیسی قدسیدا هاتووە کەخوای گەورە لەرۆژی دوایی بە ڕیا کارەکان دەڵێ [إذهبوا الى الذين كنتم تراءون اليهم في الدنيا انظروا هل تجدون عندهم جزاء] ڕیوایەتی ئیمامی ئەحمەدو بیهقیە - واتە [بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کە ئیشتان بۆ دەکردن بە ڕیا لە دونیا ئایا پاداشتیان پێ دەدرێتەوە] وە پێغەمبەر لە حەدیسێکا دەفەرموێت (د.خ) [إن الله حرم الجنة على كل مراءٍ][1] واتە [بەڕاستی خوا بە هەشتی قەدەغە کردووە لە هەموو ڕیاچیەك] [سەرنج][2]

---

(١)رواه ابو نعيم والديلمي

(٢)ڕای زاناکان ئەوەیە هەر کردەوەو چاکەیەك بە مادە لایی و ڕیا کارانە بێت هیچ پاداشتی بۆ نانووسرێ مەگەر پەشیمان بێتەوەو واز لەم کارە بەدە بهێنێت.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت [ومَن یقتل مؤمناً متعمداً فجزاءهُ جهنم خالداً فیها وغضِب الله عَلیهِ ولعنهُ واعدَّ له عذاباً عظیماً] سورەی نساء ئایەتی ٩٣ واتە [کەسیّ بە ئەنقەست موسڵمانێك بکوژێت ئەو پاداشتی دۆزەخە هەتا هەتایە وەخودا رقی خۆی بەسەردا دەرژێنی و وەنەفرەتی لیّ دەکاو وەسزایەکی سەختی بۆ ئامادە دەکات] وە پێغەمبەری خودا (د.خ) دەفەرموێت [أول ما یقضی بین الناس یوم القیامة في الدماء] ـ رواه البخاری ومسلم ـ واتە [یەکەم شت کەخوا رۆژی دوایی پرسیاری لەسەر دەکات بریتییە لە پیاو کوشتن واتە خوێن رشتنە] وە لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت [أول ما یحاسب علیه

العبد الصلاة واول ما يقضي بين الناس في الدماء] ـ رواه النسائي ـ واته [يەکەم شت کە بەندە پرسیاری لەسەر لێ

دەکریت نویژە وە یەکەم شت کەخوا فەرمانی لەسەر دەر دەکات لە نێوانی خەڵك خوێن رشتنە وە خودا دەفەرموێت [ولا تقتلوا النفس التي حرم الله بالحق] سورەی الاسراء آیـة ۳۳ واتـە[ئـەو کەسـانە مەکوژن کەخودا کوشتنی قەدەغـە کردونـە تەنهـا مەگـەر بەرەوا نەبێت] پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت [اجتنبوا السبع الموبقات وعد منها قتل النفس التى حرم الله الا بالحق] واتـە (خۆتان بپارێزن لەحەوت تاوانی فەوتێنەر یە کێك لەوانە کوشتنی کەسێکە کەخودا قەدەغەی کردووە مەگەر بە رەوانەبێ ئەم روایە کە پێـغـەمبـەر (د.خ) رێگـای کوشتنی داوە ئەوەیـە کە دەفەرموێت [لا يحل دم امرئ مسلم الا باحدى ثلاث كفر بعد ايمان وزناً بعد احصان وقتل نفس بغير الحق] متفق عليه ـ واتە رەوا نی یە رژانی خوێنی موسڵمان تەنها بەسێ شت نەبێت پاشگەز بوونەوەی پاش ئیسلام بوونی داوێن پیسی پاش شووکردن یان ژن هێنان کوشتنی کەسێك بەبی تاوان وەخوای گەورە لە سورەی فرقاندا ئایەتی ـ ٦٨ ـ دا ئەفەرموێت [والذين لا يدعون مع الله إلهاً آخر] واتە (ئەو بەنـدانـەی کە بێجگـە لە بەرنـامەی خودا ئیش بە هیچ بەرنامەیەکی تر ناکەن) وەلە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێت

[ولا يقتلون النفس التي حرم الله إلا بالحق ولا يزنون ومن يفعل ذلك يلق أثاماً[1]] واته (ئەو کەسانە ناکوژن کە خودا کوشتنی قەدەغـە کردون تەنهـا مەگەر بەرەوا نەبێت وە داوێن پیسی ناکەن وەهەر کەسی ئەم کردەوانە بکات تاوانبار دەبێ خوا سزایەکی سەختی دەدات) وە بەشەکەی تری ئەم ئایەتە دەڵێت [يضاعف له العذاب يوم القيامة ويخلد فيـه مهـانـاً إلا من تاب وآمن وعمـل عملاً صالحاً]واتە سزایەکی توند دەدرێن وە ئازارو سزاکەیان زیاتر دەکرێت چونکە بێجگە لە کافری بێ باوەری ئەوانە پیاو کوژو داوێن پیس بوونە وە لەم ئازارەدا دەمێنێتەوە بە سووکیو بێ نرخی بەمەشا دەکرێن هەتا هەتایە مەگەر ئەوانەی کە پەشیمان دەبنەوەو باوەر دەهێنن و کردەوەی چاك دەکەن خوا لەو کەسانە خۆش دەبێت چونکە خوا بە بەزەیی و میهرەبانە وە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت

[وان اكبر الكبائر عند الله يوم القيامة الاشراك بالله وقتـل النفس المؤمنة بغير الحق] ـ رواه البخاري ـ واتا [گەورەترین تاوان لای خوا لە رۆژی دوایدا هاوبەش بۆ خودا پەیـدا کردن و کوشـتنی کەسێکی برواداره بەبێ تاوان] وەهەروەها حەزرەت (د • خ) فەرموویەتی [من أعان

(١)ووشەی (يلق اثاماً) لە تفسیری روح المعاني لاپەرە ٤٨ بەرگی ١٩ دا دەڵێت شیوێکە لە شیوەکانی دۆزەخ پرە لەخوێن و خێزاوە

على قتل مسلم بشطر كلمة لقى الله مكتوب بين عينيه ايس

من رحمة الله تعالى] رواه ابن ماجه ـ واحمد ـ واته [هەر کەسێ بەشـداری بکات بۆ کوشتنی موسڵمانێك ئەگەر بە

قســەیەکیش بێت بە عزوور خوا دەگات لە ڕۆژی دوایی وەلە نێو چەوانی نوسراوە بێ بەشە لە بەزەیی خوا لە (ابن عبـاس) دەگـێردرێتـەوە کەوا یەکێك کوژرا لە سەردەمی حەزرەت (د٠خ) لەشـاری مەدیـنـەدا نەزانــرا کێ کوشتـویـەتی پێغەمبەر (د٠خ) تەشریفی بەسەر دوانگە (منبر) کەوت فەرمووی [أیها الناس یقتل قتیل وأنا فیکم ولا یعلم من قتله] واتــە فەرمـووی [مـوسڵمانینە یەکێك یەکێکی کوشتووە منیش لە ناو ئێوە دام و نەزانراوە کێ کوشتویەتی] پاشان فەرموی

[لو اجتمع أهل السماء والارض على قتل امرىء مؤمن لعذبهم الله إلا ان یفعل ما یشاء] واتە [ئەگەر خەڵکی زەوی وئاسمان خربیتەوە لە سەر کوشتنی مرۆیەکی موسڵمان سزایان دەدەم تەنها مەگەر خودا خۆی سزاکە دوابخات] حەزرەت (د٠خ) ئەفەرموویێت [کل ذنب عسى الله ان یغفره الا الرجل یموت کافرا او الرجل یقتل مؤمنا متعمدا]ـ رواه النســائی والحــاکم ـ واتــە [لەوانــە خودای بە بەزەیی

لەهەموو تاوانێك خراپتر بێت ئەوەیە كەسێك بەكافری بمرێت

یان پیاوێك مرۆڤێكی موسڵمانی بێ تاوان بەئەنقەست بكوژێت.

[سەرنج]

شێخ ابن الحجر ئەفەرمووێ لەپەرتووكی (الزواجر) زانایان رای جیاوازیان هەیە كە پاش هاوبەشی دانان بۆ خودا گەورەترین تاوان بریتییە لە كوشتن بەڵام ئەوەی راست و بێ گومان بێت پاش هاوبەش بۆ خودا پەیدا كردن كوشتنی بەئەنقەست بریتییە لە مەزن ترین تاوان.

خودا دەفەرمووێت (ولكن الشياطين كفروا) بەڵام شەیتانی ئادەمیزادو جنۆکە باوەڕیان بەهێزی خودا نەبووە (یعلمون الناس السحر) ـ سورەتی بەقەرە ئایەتی ١٠٢ ـ واتە (هونەری جادوگەری فێری ئادەمیزاد دەکەن و تاکو ئێستاش هەر فێریان دەکەن وەخوا لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت [ولا یفلح الساحرون] سورەتی یونس الآیة ٧٧ واتە [هیچ لەو جادو گەرانە ڕزگاریان نابێ‌و بەئاوات ناگەن] پێغەمبەر (د٠خ) دەفەرموێت [ اجتنبوا السبع الموبقات قیل یا رسول الله وماهنّ؟] قال [الشرك بالله والسحر وقتل النفس التي حرم الله الآ بالحق واكل مال اليتيم واكل الربا والتولي يوم الزحف وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات]ـ متفق عليه ـ واتە [ئاگاداربن لە حەوت تاوانی فەوتێنەر وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەم

تاوانانه کامانەن؟]فەرمووی [هاوبەش بۆخودا پەیدا کردن وەجادوگەری وەکوشتنی کەسێك کەخودا قەدەغەی کردوە بەناڕەوا وەخواردنی ماڵی بێ باوك وەخواردنی سوو وە هەڵاتن لە شەڕی کافراندا

ئابروو بردن و بوختان کردن بەو ئافرەتانەی کە بێ ئاگان پێغەمبەری خودا دروودی خوای لێ بێ لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت [ثلاثة لا يدخلون الجنة مدمن خمر وقاطع الرحم ومصدق بالسحر] رواه احمد والحاكم ـ واتە [سێ کەس ناچنە بەهەشت یەکەم دەوام کردن لە خواردنەوەی عەرەق تا کۆتایی ژیان دووەم بڕینی پەیوەندی و سەردان لە کەسایەتی سێهەم کەسێك بڕوای بەجادوگەر هەبێ] لە بجالەی کوڕی عەبدە ڕیوایەت کراوە [أتانا كتاب عمر (رض الله عنه) قبل موته بسنة «أنا اقتل كل ساحر وساحرة»] رواه الامام البخاري ـ واتە [کتابی عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) هات بۆ لام ساڵێك بەر لە کۆچ کردن کەوا هەموو جادوگەری پیاو ژن بکوژن].

---

[ سەرنج ] زانایانی ئاینی بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئیمامی شافعین (ڕ.خ) ئەفەرموون جادوگەر ناگوژرێ وە کافریش نابێت بەمەرجێك بەنەزانی بزانێ جادوو دروستە لە ئیسلام دا بەڵام ئەگەر جادو گەرەکە زانی قەدەغەیەو لەسەری بەردەوام بوو ئەوا کافر دەبێ (هەروەها ئیمامی ئەوەوی) (ڕ.خ) ـ دەفەرموویی کارو پیشەی جادوگەری دروست نی یە وە بەکۆمەڵی ڕای هەموو زاناکان یەکێکە لە تاوانە گەورەکان

# تاوانی چوارەم

# وازهێنان
# لە
# نوێــژ بە ئەنقــەست

[ترك الصلاة عمداً]

خوای مەزن دەفـەرمووێت [ما سلككم في السقر؟ قالوا لم نك من المصلين] سورة المدثر آية ٤٢ ـ واتە [ئەو کەسـانەی کە سەر فرازو شادمان ئەبن لە ڕۆژی زیندو بونەوەدا پرسیار ئەکەن لە تاوانبارە گیرۆدە بووەکان چی هۆیـەك بوو ئێـوەی فڕێ دایـە ناو (سـەقـەر)ەوە یانی دۆزەخـەوە ئەوانـیش ئەڵێن لە نوێـژ کەران نەبـووین] موسڵمـانـە بەرێـزەکـان دەربارەی نوێژ نەکەر ئایەت و فەرمـوودەیـەکی یەك جار زۆر هاتـووە بە چەند جۆرێك فەرموودەکانی ریوایەت کراون وە بەم جۆرەی کە (شیخ ابن الحجر) لە (زواجر) باسی کردووە ئەمانەن:

حەزرەت دروودی خوای لە سەر بێت دەفەرمووێت [بين الرجـل وبين الكفر ترك الصلاة] رواه البخاري واحمد ـ واتە [جیاوازی لە نێوان ئادەمیزادو کافر بونیدا نەکردنی نوێژە] وە لە ریوایەتێکی تردا پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت [ليس بين العبد وبين الكفر إلاّ ترك الصلاة] رواه ابو داود والنسائي [جیاوازی لەنێوان بەندەی موسڵمان و بەندی بێ باوەڕ بریتی‌یە لە واز هێنان لە نوێژ] وەلە فەرمودەیەکی تردا دەفەرمووێت [بين الكفر والايمان ترك الصلاة] رواه الترمـذي واتـە [جیـاوازی نێوان بڕوایی و بێ بڕوایی

وازهێنانه له نوێژ] پێغەمبەر (د.خ) له فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت [العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر] رواه احمد وأبو داود والنسائی ـ واته [پەیمانی نێوان ئێمە و ئەوان نوێژه هەر کەسێك له نوێژ واز بێنێ بەراستـی ئەو بێ باوەڕه] وه دیسـان حەزرەت (د.خ) دەفەـرموێت [من ترك الصلاة متعمداً فقد كفر جهاراً] رواه الطبـرانی واتـه [کـەسێـك به ئەنقـەست نوێـژێك بچـوێنێت بەراستی وه بەئـاشکـرا بێ باوەڕ بووه] وهله فەرموودەیەکی تردا حەزرەت (د.خ) ئەفەرموێت [من لم يصـلِ فهو كافر] رواه البخاري ـ هەرکەسێ نوێژ نەکات ئەوەبێ باوەڕه. [سەرنجێك]

چالێردا ئەم پرسیـاره دێتـه پێشەوه بەپێی ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر (د.خ) ئاخۆ ئەبێ نوێژ نەکەر بەبێ بروا (کـافـر)دابنرێت؟ ئەوەی جێی سەرنجه ئەوەیه که هەندێ لەزانایان دەفەرموون ئەم فەرموودانەی پێغەمبەر (د.خ) له سەر ئەو کەسانه پاسادان (تطبيق) دەکرێت که دەڵێن نوێژ کردن گرنگ نی یەو باوەڕیان بەفەرز بوونی نی یه بەڵام راستی یەکەی ئەوەیه که موسڵمان به نوێژ نەکردن (کـافـر) نابێ واتـه بێ باوەڕ نابێ بەڵکـو بەبێ دین و [فاسـق] واته له رێگا لادان ئەناسرێت له زواجری شيخ [ابن الحجر] لاپەڕه ١٣١ دەفەرموێت زانا ئاینی یەکان دەربارەی نوێژ نەکەر رای جیاوازیان هەیه بەڵام زۆربەی

فەرموودەکان دەست نیشانی ئەوە دەکەن کە نوێژ نەکەر بێ باوەڕە دەرچـووە لە دینی موسڵمانان لەگەل ئەوەشدا هاوەڵەکـانی پێغـەمبـەر (د.خ) هیچ کردەوەیەکیان بەبێ باوەڕی دانــەدەنا تەنها نوێژ نەکردن نەبێ بەبێ بەڵگەی شەرعی بەڵام ئیمـامی شافعیو هەنـدێك لە زاناکانی تر دەڵێن نوێژ نەکەر (کافر) و بێ باوەڕ نابێت مەگەر دانی پیا نەنێت وە بڵێت نوێژ کردن فەرز نی‌یە.

## [باسێك لە بارەی گوناهی دواخستنی نوێژ]

خوا دەفەرموێت [فخلف من بعدهم خلف اضاعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غياً] سورة مريم آية ٥٩ واتە [لە پاش خۆیان دەستەیەكیان بەجێ هێشت كە نوێژیان دوا دەخست و سەریان بۆ ئارەزوویان دادەنواند ئائەوانە لەمەو دوا بەرەنگاری سزایەكی زۆر سەخت دەبن] وە لە دواییدا خودا دەفەرموێت [الا من تاب وآمن وعمل صالحاً] واتە [مەگەر ئەوانە پەشیمان ببنەوە وكردەوەی چاك بكەن] (عبداللەی كوڕی عباس) خوای لێ رازی بێت لێرەدا ووشەی (اضاعوا) مانای دۆڕاندن و وازهێنانی نییە بە تەواوی بلكو سستیو كەمتەرخەمی نوێژ كەردنەیە لە كاتی خۆی وە (سەعیدی كوڕی مسیب) پێشەوای گەورەی تابعین[1] خوالێی رازی بێت دەڵێت ئەو كەسانەیە كە نوێژی نیوەرۆ ناكەن هەتا ئەیگەیەنن بە نوێژی عەسر وە نوێژی عەسر ناكەن تاكوو دەی گەیەنن بە نوێژی ئێوارە (مغرب) وە نوێژی مغرب ناكەن تا دەگەیەنن بە نوێژی شەو (عشاء) وە نوێژی شەو ناكەن تا دەگاتە نوێژی بەیانی وە نوێژی بەیانی ناكەن تا رۆژ هەلدێت زمانای وایە نوێژەكە دەچوێنن وە دەی فەوتێنن)

---

(1) تابعین بەو كەسانە دەڵێن كە بەخزمەتی یارانی محمد (د.خ) گەیشتوونە.

وە هەر کەسێك بمرێت و سوور بێت لە سەر ئەم کردەوەیەو پەشیمـان نەبێتـەوە خوای گەورە پەیمان و بەڵێنی داوە بیخاتە ناو «غي» کەشوێنێکی زۆر قوڵە لە دۆزەخ سزای زۆر سەختە وە خوای گەورە دەفەرموێت [فويل للمصلين الذين هم عن صلاتهم ساهون] سورة ماعون آية (٥) واتە [هاوار بۆ ئەو کەسانەی کە لە نوێژ کردن سستی دەکەن و بێ ئاگان و دوای دەخەن] وە حەزرەت دروودی لە سەر بێت دەفەرمووێت [هم الذين يؤخرون الصلاة عن وقتها] واتە [ئەو کەسانەن کە نوێژ دوا دەخەن لە کاتی خۆیدا هەتا ئەی چوێنن] وەخوا لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت [يا أيها الذين أمنوا لا تلهكم اموالكم ولا اولادكم عن ذكر الله ومن يفعل ذلك فأولئك هم الخاسرون]سورەتی [المنافقون] ئایەتی ٩ واتە [ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە بامالُ و منالُتان بێ ئاگاتان نەکات لە یادی خوا وەئەگەر گوێ بە نوێژەکانی نەدات بێ بەشە لەڕەحم و بەزەیی لەڕۆژی دواییدا].

وە زۆر لە موفەسیرەکان دەڵێن مەبەست لە [ذكرالله] لێرەدا مەبەستی پێنج فەرزە نوێژەکەیە هەر کەسێ کەوا خۆی زۆر خەریك بکات بەماڵی دونیا لەکڕین و فرۆشتن و ڕۆژی پەیدا کردندا یا خود منداڵ ئەوا ئەو شتانە مرۆڤ بێ ئاگا دەکەن لەیـادی خوا ئەوانەش کە شتیوا دەکەن هەر زەرەرمەند دەبن. وە حەزرەت (د.خ) ئەفەرمووێت [من فاتته صلاة

فكأنما وتر أهله وماله] واته [هەر کەسێ تەنها نوێژێکی لە کیس بچێت وەك ئەوا وایە کە هەرچی ماڵ و سامان وخێزانی هەیە تیا چوو بێت وەبە تەنها خۆی ما بێتەوە] ڕۆژێك حەزرەت (د.خ) باسی گەورەیی و گوناهی نوێژی دەکرد دەیفەرموو - وەك عەبدوڵای کوڕی عومەر دەی گێڕێتەوە [من حافظ عليها كانت له نوراً وبرهاناً ونجاة يوم القيامة ومن لم يحافظ عليها لم يكن له نور ولا برهانٌ ولا نجاة وكان يوم القيامة مع قارون[1] وفرعون[2] وهامان[3] وأبي بن خلف[4]] رواه

---

(١) قارون یەکێك بووە لە هەژارانی سەردەمی حەزرەتی (موسا علیە السلام) هات بۆ لای حەزرەتی (موسی - ع ) لێی پاڕایەوە دوعای بۆ بکات خوا ڕزقی زۆری بداتێ حەزرەتی موسا کیمیاگەری دەزانی جا قارونی فێر کرد قارون سەرەنجام دەولەمەند بوو سەروەت و سامانی گەیشتە پلەی لەژمارە نەئەهات حەزرەتی موسا داوای لە قارون کرد زەکاتی لێ دەربکات بەڵام قارون بەسەرانەی دانا و لە پاشان خوا لەناوی برد بەسەرو سامانەوە.

(٢) فرعەون پاشایەکی زۆر داربوە

(٣) هامان وەزیری فرعەون بوە

---

(٤) ئوبەیەی کوڕی خەڵەف لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) بووە زۆر ئازاری پێغەمبەرو یارانی داوە بەکافری تۆپیوە.

احمد واته [هەر کەسێ پارێزگاری نوێژ بکات ئەوا ئەو نوێژە ئەبێ بە رووناکی و بەڵگە لە ڕۆژی دواییدا وەرزگار بوونی خاوەنەکەی وەشەو کەسەی پارێزگاری نوێژ نەکات رووناکیو بەڵگەو رزگار بوونی بۆ نی یە لە ڕۆژی دواییدا وەلە پاشە ڕۆژدا لەگەڵ قارون و فیرعەون و ئوبەیەیی کوری خەڵەف ئەبێ] وە هەروەها پێویستە کە ئاگاداری نوێژەکانمان بکەین لە بارەی (سجدە) واتە کرنوش بردن (رکوعەکانی) بە تەواوی جێبەجێیان بکەین وەك لە عەبدولای کوری ئەشعەری یەوە ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر (د.خ) چاوی کەوت بە پیاوێك (رکوعەکانی) تەواو نەدەکردو گرنگی بە (سجدە) واتە (کرنوش) نەدەدا پێغەمبەر (د.خ) پێی فەرموو [لو مات هذا علی حاله مات علی غیر ملة محمد] رواه الطبرانی وابو یعلی باسناد حسن واتە [ئەم مرۆڤە کە گرنگی بەنوێژەکەی نادات] ئەگەر بەم حاڵەوە بمرێ ئەوە لەسەر غەیری میللەتی محمد ئەمرێ [سەرنج] دواخستنی نوێژە فەرزەکان بە ئەنقەست بەبێ بیانوویەکی شەرعی لە تاوانە گەورەکان ئەژمێردرێ وە پێویستە هەر نوێژێك کە فەوتا یەکسەر بەقەزا بگێردرێتەوە وە پێویستە لە سەر هەموو موسڵمانێکی خاوەن باوەر ئامۆژگاری ئەو کەسانە بکات نوێژ ناکەن وەیان وازیان

لەنوێژ هێناوە بەتاییەت ئەوانەی کە مافیان هەیە لەسەرمان وەك خزم و کەس و منداڵەکانمان حەزرەت (د.خ) دەفەرمووێت [مروا صبیانکم بالصلاة لسبع سنین واضربوهم علیها لعشر سنین وفرقوا بینهم في المضاجع] رواه ابو داود واتە [فەرمان بدەن بەمناڵەکانتان بە نوێژ کردن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا وە لەتەمەنی دەساڵیدا سەرزەنشتیان بکەن لەسەر نوێژ واتە بیان ترسێنن بەلێدان بۆ کردنی نوێژ وە جیایان بکەنەوە لەجێگای خەوتندا] پێشوای بەرێز [ئەبوو سولەیمانی خەتابی] کەزانایەکی خاوەن بلیمەت بووە دەڵێت وە ئەفەرمووێت [هذا الحدیث یدل علی اغلاظ العقوبة له اذا بلغ تارکاً لها][1] واتە [ئەم فەرموودەیە ئەبێ بە بەڵگە لەسەر سزایەکی بەهێزو سەخت بۆ ئەو کەسانەی کەخۆیان ناسیوە و پێگەیشتوونەو نوێژ ناکەن وازیان لێی هێناوە.

بروانە (الکبائر) لاپەرە (٢٢) دانراوی شمس الدین الذهبی

## باسێك لەبارەی
## تاوانی دواخستنی و واز هێنانی نوێژ بەكۆمەڵ (جماعەت)

حەزرەت دروودی خوای لەسەر بێت دەربارەی ئەو كەسانەی كەواز لە نوێژی كۆمەڵ دەهێنن دەفەرمووێت [والذي نفسي بيده لقد هممت أن آمر بحطب فيحتطب ثم آمر بالصلاة فيؤذن لها ثم آمر رجلاً فيؤم الناس ثم أخالف الى رجال فأحرق عليهم بيوتهم ] متفق عليه واتە [سوێند بەو كەسەی منی بەدەستە بیروباوەڕم وایە كەفەرمان بكەم داروو چیلكەیەكی زۆر كۆ بكەنەوە وەلە پاشان فەرمان بدەن بەبانگدەر كە بانگ دا بۆ نوێژ لە پاشان پیاوێك بكەن بەپێش نوێژ [امـام] پاشان بچم بۆماڵی ئەو پیاوانەی كەنایەنە نوێژی [جماعەت] واتە كۆمەڵ ماڵیان بەسەردا بسووتێنم ] لە ئەبی هورەیرە دەگەێرنەوە خوا لێ رازی بێت كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی [ان اثقل صلاة على المنافقين صلاة العشاء وصلاة الفجر] واتە [گرانترین نوێژ لەسەر دوو روو ناپاكەكان نوێژی بەیانی و نوێژی ئێوارانە] پاشان لەكۆتایی فەرمودەكە دەفەرمووێت [ولو يعلمون ما فيها لا توهما ولو حبوا] رواه البخاری ومسلم واتە [بەڵام ئەگەر ئەو دوو رووانە بیبیان زانیایە ئەم دوو نوێژ چ خێرو پاداشتیكی تێدایە ئەوە بە

گاگـۆلْكێ واته لەسەر چۆك بۆی دەرۆیشتن و دەچوون چونكه بەراستی خێرو پاداشتی نوێژی بەكۆمەڵ یەك جار زۆر خێره وەك حەزرەت (د.خ) دەفـەرمـوویێت [صـلاة الجماعة افضل من صلاة الفذ (اي المنفرد)بسبع وعشرين درجةً]

[واته نوێژێك كه به كۆمەل بكریت باشتره و خێری زیاتره له نوێـژێـك كه به تەنها بكریت به بیست و حەوت پله] هەروەها پێویسته ئەو كەسانەی نوێژی بەكومەڵ ئەكات ئاگـاداری مەرجـەكانی نوێژەكه بكات له كاتی [ركوع و سجـود] واتـه هەڵسان و دانیشتندا ئەگەر بەئارەزووی خۆی سەرپێچی پێش نوێژی كرد له نوێژەكەیدا واته پێش [ئیمام] بكەوێت نوێژەكەی بەتاڵەو دانامەزرێ هەر وەكو حەزرەت (د.خ) له فەرمووده‌یەكا ئەفەرمووێ [اما يخشى احدكم اذا رفع رأسه قبل الامام أن يجعل الله رأسه رأس حمار أو يجعل الله صورة حمار] رواه البخاري واته (ئایا ناتـرسێ یەكێ له ئێـوه یا بۆچی ناترسێ یەكی لەئێوه هەر كاتێـك پێش ئیمام له نوێژدا سەری بەرز بكاتەوه خوای گەوره سەری بگـۆری بەسـەری گوێ درێـژ یا وێنـەی بەرێته وێنەی گوێ درێژەوه

## [تێبینـــی]

نوێژی بەکۆمەڵ بەلای ئیمامی ئەحمەدەوە (ر.ض) فەرزی عەینەو لای ئیمام شافیعی (ر.ض) فەرزی کیفایەیەو بە هەر دوو شێـوەکـە زانـاکـانی ئایینی تەرکی نوێـژی (بەکۆمەڵیان) بە تاوانی گەورە داناوە[١]

---

(١)بـڕوانە زەواجری شیخ ابن وحەجەر هەیتەمی بەرگی یەکەم لاپەرە -١٤٤-.

## له بارەی تاوانی

## وازهێنانی نوێژی هەینی (جمعة)

خوای گەورە دەفەرمویت [یا ایها الذین آمنوا اذا نودي للصلاة من یوم الجمعة فاسعوا الی ذکر الله وذروا البیـع ذالکم خیر لکم إن کنتم تعلمـون] سورة الجمعـة آیة(٨) واتە [ئەی ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕن هەر کاتێك بانگـەواز کرا بۆ نوێـژی هەیـنـی لە ڕۆژی هەینیدا بەخـێرایی‌و بەگورجی پێشوازی بانگەوازەکەی خوابکەن بڕۆن بۆ بەجێ هێنانی فەرزی نوێژی هەینی واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن ئەوە باشترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن] لە أبی جعد کوری ضمیری‌یەوە دەگێڕنەوە کەوا زۆر هاوڕێیەتی پێغەمبەری (د.خ) کردووە ئەڵێ حەزرەت فەرموویەتی [من ترك ثلاثة جمع تهاوناً طبع الله علی قلبه] رواه احمد وابو داود والنسائی ـ واتە [هەر کەسێك بە ئارەزوو سێ نوێژی

هەینی بچوێنێ بەبی هیچ بیانویەکی شەرعی خوای گەورە مۆری تاوان باری ئەدا بەسەر دڵیدا] وە لە فەرمودەیەکی ترا حەزرەت (د.خ) ئەفەرموویێت [من ترك ثلاث جمعات من غير عذر كتب من المنافقين] رواه ابن حبان واتە [هەر کەسیك بەبێ بیانویەکی شەرعی سێ نوێژی هەینی بچوێنی ئەوەلە ریزی ناپاکان دەنوسرێت] ئیمامی ترمذی لە (ابن عباس) ریوایەتی کردوە کەوا پرسیار کرا دەربارەی پیاوێك کە بە رۆژ بە رۆژو دەبێت و بەشەو نوێژ دەکات بەڵام لەگەل ئەوەشدا (جومعە و جماعەت) ناکا واتە نوێژی هەینیو نوێژی بەکۆمەڵ ناکا (ابن عباس) فەرمووی ئەو بۆ ناو ئاگرە.

——— [یاسا] نوێژی هەینی لەسەر هەموو خاوەن باوەڕێکی نیرینەی پێگەیشتوو (بالغ)ی خاوەن ژیری (عاقل) ئازادی نیشتەجێ کە نەخۆش و بیانووی شەرعی نەبێت فەرزی (عەینە) حەزرەت (د.خ) ئەفەرمویێت [الجمعة حق واجب على كل مسلم الا على اربعة عبد مملوك او امرأة أو صبي أو مريض ] رواه ابو داود واتە [نوێژی هەینی فەرزە لە سەر هەموو موسڵمانێك لە سەر چوارکەس نەبێت بەندە و ئافرەت و منال و نەخۆش]

[سەرنجێك]

س / جیاوازی نێوان فەرزی عەینیو فەرزی کیفیایەت چی‌یە؟

ج / فەرزی عەینی واتە لەسەر هەموو کەسێك فەرزەو پێویستە کە ئەم فەرمانەی خوا جێبەجێ بکات بۆ نموونە نوێژی (هەینی) وە فەرزی (کیفایە) واتە کۆمەڵێك لە خەڵکی ناوچەکە ئەم فەرزە جێبەجێ بکەن تاوانەکە لەسەر هەمووان لادەچی بۆ نموونە نوێژی (جماعەت) واتە (بەکۆمەڵ) [ئاگادارێیك] بەرای هەموو زاناکان (نوێژی هەینی فەرزی عەینە) وە هەر کەسێ وازی لی بێنێت بەتاوانی گەورە دادەنرێت بە مەرجێك هیچ بیانویەکی شەرعی نەبێت ـ بڕوانە (الكبائر او الزواجر) بەرگی یەکەم لاپەڕە / ١٥١.

خوای گەورە دەفەرموێت [وویلٌ للمشرکین الذ
یؤتون الزکاة] سورة فصلت آیە (٦) واتە [قور بەسە
ئازاری سەخت بـۆ ئەو هاوبەش پەیدا کەرانەی کە ز
نادەن] بروانە خوای گەورە زەکات نەدەری بە هاو
پەیداکەر ناوبردووە وەلە ئایەتێکی تردا دەفرمووێت
یحسبن الذین یبخلون بما أتاهم الله من فضله هو خ
بل هو شـر لهم سیطوقون ما بخلو به یوم القیامة] س
آل عمران آیة (١٨)

واتە [باگومان نەبەن ئەوانەی کە رەزیلی دەکەن کەو
ماڵ وسـامانێکی زۆری پێ بەخشیوە و زەکاتی ماڵ
نادەن ئەوانە قازانج ناکان بەڵکو زیانیان پێ دەگاو
ئاگرین لە ئەستویان دەکری لە ڕۆژی دوایی]
وە لە ئایەتێکی تردا

دەفەرموویت [والذین یکنزون الذهب والفضة ولا ینفقونها في سبیل الله فبشرهم بعذاب ألیم] سورة التوبة آیة (٣٤) واتە ئەوانەی کەوا زێرو زیوو پارەو سامانیان هەیەو کۆی دەکەنەوەو خەرجی ناکەن لە ڕێی خوادا واتە زەکاتی مالی خوای لێ نادەن ئەوا موژدەیان بدەنێ بەچێشتنی ئازارێکی بەئێش وەلە کۆتـایی ئایـەتەکە دەفەرموویت [یوم یُحمی علیها في نار جهنَّمَ فتکوی بها جباههم وجنوبهم وظهورهم هذا ما کنـزتم لانفسکم فذوقـوا ماکنتم تکنـزون] سورة التــوبـة آیـة (٣٥) واتــە [ئەوڕۆژ دێت کەڕۆژی لێ پرسینەوەیە کە تیایدا ئەو زێرو زیوو پارەو سامانە

بە ئاگری دوزخ سور

دەکرێتەوە و بەلەشیانەوە دەنێن ناوچەوان و تە نیشتیان و پشتیـان پێ داخ دەکـرێت پاشان فریشتەی سزا پێیان دەڵێن ئەو سزا سەختە بچێژن وەهەر بەو زێرو سامانەی کۆتـان کردوتەوە سزای پێ دەچێژن]لە ئەبی هورەیرەوە ریـوایـەت کراوە کە حەزرەت (د.خ) دەفەرموێت [مامن صاحِب ذهب ولا فضّــة لا یؤدي منهــا الا اذا کان یوم القیامة صفحت له صفائح من نار جهنم فیکوی بها جنبه وجبینه وظهره]

متفق علیه واتە [هەر کەسێك لە دونیادا خاوەنیی زێـرو زیـوو بێ‌و زەکاتی لێ کەوتبێ‌و پاشان زەکاتی لێ

نەدابێ ئەوا ئەم زێـرو زیوە دەکرێتە بەرگێکی ئاگرین و لەبەری دەکرێ لە دۆزەخدا پاشان پشت و نێوچەوانی پێ داخ دەکەن] عەبدوڵای کوری مسعود رەزای خوای لێ بێ ئەفەرموێت [أمرنا باقام الصلاة وإيتاء الزكاة ومن لم يزكّ فلا صلاة له] رواه الطبـراني واتە [فەرمانمان پێ کراوە بەنـوێـژ کردن و بەزەکات وە هەر کەسێك زەکات نەدات نوێـژی لێ وەرنـاگـیرێ] وە هەروەها حەزرەت (د.خ) لە فەرمـوودەیـەکی تردا ئەفەرموێت [مامنع قوم الزكاة الا ابتلاهم الله بالسنين] رواه الطبراني واتە [هەر نەتەوەك دەستیان بەسەر زەکات داگرت و نەیان دا جێگای خۆیەتی خوا تووشی گرانیو نەهـاتیـیـەکیان بکا] وە لە ریوایەتی حاکم و بەیهـەقی ئەمەشسی لێ زیاد کراوە [ولا منع قوم الزكـات الا حبس الله عنهم القطر][1] واتە [هەر نەتەوەك قەدەغـەی زەکـات بکـات ئەوە خوای گەورە بارانیان لێ قەدەغـە دەکـات [تێبینی] هەر کەسێك زەکاتی بکەوێتە سەریو نەیـدات ئەوە بێ گومـان لە تاوانـە گەورەکـان دەژمـێردرێت ئەگەر هاتوو یەکێك یان کۆمەڵێك قەدەغەی زەکاتیان کرد یان یاخی بوون لە نەدانیو واتە وایان دانا کەوا زەکات فەرز نییە ئەوە لەبەر ئەم هۆیە وەردەگەرێن لە ئاینی ئیسـلام و بە هەڵگەراوە دادەنرێن چونکە ئایەت و

(١)رواه الحاكم والبيهقي

فەرمودەی ئاشکرا هەیە لە بارەی زەکات دان و کە فەرزە لەسەریان ماڵی خوا بدەن بەهەژارو داماوان[٢] .

(٢) بروانه الخطايا في نظر الاسلام ص ٢٢٣ عفيف عبد الفتاح طبارة.

## تاوانی شەشەم

# شکاندنی ڕۆژوویێک لە ڕۆژەکانی ڕەمەزان

[ ترك صوم يوم من ايام رمضان والأفطار فيه ]

خوای گەورە ئەفەرموویێت [یاأیها الذین آمنو كتب علیكم الصیام كما كتب علی الذین من قبلكم لعلكم تتقون] واتە [ئەی ئەو كەسانەی كە خاوەن باوەڕن لە سەر ئێوە فەرزە كراوە ڕۆژو گرتن هەروەك لەسەر نەتەوەكانی پێش ئێـوەش فەرز كرابـوو بەڵكـو تكـاوایـە بەهـۆی ئەم خواپـەرستنـەوە خۆتـان بپارێزن لەخراپەو خراپەكاری] پاشان لەكۆتایی ئایەتەكە دەفەرموویێت

[أیاماً معدوداتٍ فمن كان منكم مریضاً أو علی سفرٍ فعدة من أیـامٍ آخـر] البقـرة (١٨٤) واتـە [ڕۆژوتان لەسەر فەرزكراوە بۆ چەند ڕۆژێكی دیاری كراو جا هەر كەسێك لەئێوە نەخۆش كەوت یان لەسەر (سەفەر) بوو وە بە ڕۆژوو نەبوو با لە باتی ئەو ڕۆژانەی كەتیا بەڕۆژوو نەبوو چەند ڕۆژێكی تر بگرێتەوە] پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویێت [من أفطر یوماً من رمضان من غیر رخصةٍ ولا مرض لم یقضه صوم الدهر كله وان صامه] رواه الخمسة الا مسلما واتە [كەسێك یەك ڕۆژ لەڕەمەزان بشكێنیو بەبێ هۆ بەڕۆژوو

ئەوە [ واتە بە موڵەتێکی شەرعی نەبێت ڕۆژووی ڕەمەزان ئە
دابکات لە حەنگەی ئاگایەتەوە ئەگەر بیشی گرتەوە] هەروەها
حەزرەت (د.خ) دەفەرموێت [عُرى الاسلام و قواعد
الدين ثلاثة عليهن أسس الاسلام من ترك واحدة منهن
فهو بها كافر (اى) حلال الدم) شهادة ان لا اله إلا الله
والصلواة المكتوبة وصوم رمضان رواه ابو يعلى والديلمي
وە[تـەصفيه] واته [داڕێژراوەو باڵاو تەكراوە ئاين باكى
ئيسلام لەسێ شتی سەرەكی و بەوسێ شتە دامەزراوە هەر
كەسێ يەكێ لەمانە بەجێ نەهێنێ بێ باوەر [كـافر] ئەبێت
ووتنی ووشەی شەهادەت نوێژە فەرزەكان و ڕۆژوی مانگی
رەمەزان] هەروەكەسێك يەكێ لەم سێ بنچينەيە، نابنەی تيا
نەبێت بەمـوسـلمـان ناژمـێردرێت پێغـەمـبـەر (د.خ) لە
فەرمودەيەكی تردا دەفەرموێت [بني الاسلام على خمس
شهادة ان لا اله الا الله وأن محمداً رسول الله واقام
الصـلاة وايتـاء الزكـاة والحـج وصـوم رمضـان][1] واتا
[ئيسـلام لەسـەر پێنج پايە دامەزراوە يەكەم شايەتمان
دووەم نوێژ كردن سێهەم زەكات دان چوارەم حەج كردن
پێنجەم رۆژووی رەمەزان].

**[ سـەرنجێـك ]**

**رۆژو شكاندن بەبێ بەڵگەيەكی شەرعی وبەبێ هۆ
ئەمە لەتاوانە گەورەكان لە قەڵەم ئەدری بەڕای زاناكان.**

١- متفق عليه

## تاوانی حەوتەم

# وازهێنان لەحەجی
# ماڵی خوا

(ترك الحج)

خوای گەورە دەفەرمووێت [ولله على الناس حج البيت من استطاع اليه سبيلاً] سورة ال عمران واته [لەلایەن خوای گەورەوە حەجی ماڵی خوا فەرز کراوە لەسەر ئەو موسڵمانانەی کەوا توانای لەش و ماڵیان هەیە [ومن كفر فان الله غنى عن العالمين][1] واتە [هەر کەسێك باوەر نەکا بە فەرز بوونی حەج یان بڵێ حەج فەرز نی یە وەتوانای هەبێ بەڵام بەئەنقەست حەج نەکات ئەوە خوای گەورە دەوڵەمەندە بێ باکە لەو کەسە پێویستی بەهیچ کەسێك نی یە ] حەزرەت (د.خ) ئەفەرمووێت [من ملك زاداً وراحلة تبلغه الى بيت الله الحرام فلم يحج فلا عليه ان يموت يهودياً او نصرانياً][2] واتە [هەر کەسێك توانای حەج کردنی هەبێت و بەڵام بەئارەزووی خۆی نەچێت بۆحەج بەبێ هیچ بیانوویەکی (شەرعی) ئەوە ئارەزووکەیفی خۆیەتی چ لەسەر ئاینی جولەکە بمرێ و چ لەسەر ئاینی نەصرانیەوە] وە هەروەها لەپاشان حەزرەت (د.خ) ئەو

---

(١)سورة آل عمران آية(٩٧).
(٢)رواه الترمزي واحمد والبيهقي

ئایەتەی خوێندەوە وذلك أن الله یقول ﴿ولله على الناس حج البیت من استطاع الیه سبیلاً﴾ ئیمامی عومەر (د.خ) دەفەرموویت بریارم دا کە چەند کەسێك بنێرم بۆ ئەو شارو دێهاتانەی کەوا تواناى حەجی ماڵی خوایان هەیە ناچن بەبێ عوزرێکی شەرعییان هەبێت دەمەوێ باجیان لەسەر دابنێم چونکە ئەوانە بەموسڵمان ناژمێردرێن بروانە [الکبائر] لاپەرە (٣٨) هەروەها [سەعیدی کوری جەبیر] (ر.خ) یەکێك بووە لەپیاوە گەورەکان دەڵێت [دراوسێ یەکەم هەبوو خاوەنی ماڵ و سەروەت بوو وەمرد حەجی نەکرد وەمنیش نوێژی مردووم لەسەر نەکرد مانای وایە کە بە موسڵمانم نەدەژمارد] [الزواجر لاپەرە (١٩٩) بەرگی یەکەم] پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی [الاسلام ثمانیة اسهم الاسلام (أي ـ کلمةُ) سهم والصلاة سهمٌ والزکاة سهم وحج البیت سهم والامر بالمعروف سهم والنهي عن المنکر سهم والجهاد في سبیل الله سهم وقد خاب من لا سهم له] رواه البزار ـ واتە (ئاینی ئیسلام لەگەل (ووتە) کەیەوە هەشت بەشە ووتەکەی بەشێکەو نوێژ بەشێکەو زەکات بەشێکەو رۆژو بەشێکەو حەجی ماڵی خوا بەشێکەو فەرمان کردن بەچاکە بەشێکە قەدەغە کردنی خراپە بەشێکەو شەر کردن لەرێی خوا لەگەل دوژمنی

موسلمانان بەشێکە وە ئەو کەسە بەرەو [illegible]

لەم بەشانە [تێبینی] ئەم تاوانەش لە [illegible]

دەژمێردرێت بەڵێ کەسێك ماڵ و سامانی [illegible]

برواو نەچێ بو حەجی ماڵی خواو [illegible]

تاکوو دەمرێت ئەوە بە تاوانی بارایکی گەورە [illegible]

بەڵگەی ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر [illegible]

سەر بێت [واللە أعلم بالصواب] [خوای [illegible]

راستی].

## تاوانی هەشتەم

# نازاردانی
# دڵی دایك و باوك

عقوق الوالدين

خوای گەورە دەفەرموویت [واعبدوا الله ولا تشركوا به شيئاً وبالوالدين احسانا] سورة النساء آية ٣٦ ـ واتە [ئـەی ئادەمیـزاد بەندەیی خوا بکەن و بە هیچ جۆرێك هاوەبەشی بۆ خودا دامەنێن وە چاکە لەگەل دایك و باوك بکـە] وە خوا لە سورەی [الاسراء] ئایـەتـی [٢٣] ئەفـەرمـوویت [فلا تقل لهما أفٍ] واتە [بە هیچ جۆرێك نابێت ئاخ و ئۆف و داخیان لە دەست بکەین و دڵیان ئازار بدەین] وەخوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت [ان اشكر لي ولولديك والى المصير] سورة لوقمان آية ١٤ واتە [سوپاسی نیعمەتی من و دایك و باوکت بکەو وەلەدوایشدا هەر بۆ لای دەگەرێتەوە وەلە (ابن عباس) دەگێردرێتەوە کە دەیفەرموو [اطيعوا الله واطيعوا الرسول] واتە گوێ رایەڵی خواو گوێ رایەڵی پێغەمبەر (د.خ) بکەن واتە هەر کەسێك

گوێ رایەڵی خوا بکاو وەگوێ رایەڵی پێغەمبەر (د.خ) نەکات ئەوا کردەوەی لێ وەرنــاگــیرێت چونکە هەر یەکێك لەمانە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە دووەم شت کە خوا دەفەرمووێت [واقیموا الصلاة واتوا الزکاة] واتە [نوێژ بکەن و زەکات بدەن واتــە هەر کەسێك نوێژ بکات و زەکات نەدات لێی وەرنــاگیرێ سێیەم شت] خوا دەفەرمووێت [ان اشکر لي ولوالدیك] واتە [سوپاسی من و دایك و باوکتان بکەن] واتە هەر کەسێك سوپاسی خوا بکات و گوێ رایەڵی و سوپاسی دایك و باوکی نەکات لێی وەر ناگیرێ ئەم سوپاس کردنە وەك حەزرەت [د.خ] لە حەدیسا دەفەرمووێت [رضا الرب في رضــا الوالدین وسخــط الرب في سخط الوالدین] راوە التــرمــذی والحاکم واتە [رازی بوونی خوا لە گەڵ رازی بوونی دایك و باوکەو وە نارازی خوا لەگەڵ نارەزا بوونی دایــك و باوکــە] پێغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەکی تردا دەفــەرمــووێت [ثلاثة حرم الله تبارك وتعالی علیهم الجنة مدمن الخمــر والعاق والدیوث الذي یقر الخبث في اهله] رواە احمــد واتــە [سێ کەس خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغە کردون شەراب خواردنەوە بە بەردەوامی ئازاردانی دایك و باوك گەوادی واتە ئەو کەسەی کە ئیشی داوێن پیسی لە گەڵ خێــزان و ماڵی بکــرێ و قســـە نەکــا] وە لەفــەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت [کل ذنوب یؤخر الله منها ما شاء الی یوم القیامة الا عقوق الوالدین] واتە [خوا

هەموو گوناهێك دوا دەخات بۆ ڕۆژی دوایی تەنها بێ فەرمانی دایك و باوك نەبێ] فأن الله يعجله لصاحبه في الحياة قبل الممات] رواه الحاكم ـ واتە [بەڕاستی خوای مەزن لە پێش مردن تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە یا خود مناڵی خراپی دەداتێ و ئازاریان لێ ببیژێ] یەكێك لەو شتانەی كەپێغەمبەر دروودی خوای لە سەر بێت ئاگادارمان دەكاتەوە ئەوەیە لەو هۆیانە دوركەوینەوە كە دەبێتە هۆی جوێندانی دایك و باوك وەك حەزرەت (د.خ) دەفەرمووێت [من الكبائر شتم الرجل والديه قالوا يا رسول الله وهل يشتم الرجل والديه؟ قال نعم يسب أبا الرجل فيسب اباه يسب أمه فيسب أمه] رواه البخاري ومسلم واتە یەكێك لە گوناهە گەورەكان ئەوەیە جوێن دان بە دایك و باوكی خۆی بدات هاوڕێكانی فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا پیاو چۆن جوێن بە باوك و دایكی خۆی دەدات؟ پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی بەڵێ پیاو جوێن بە باوكی یەكێك دەدات ئەویش جوێن بە باوكی ئەو دەدات جوێن بە دایكی دەدات ئەویش جوێن بە دایكی ئەو دەدات.

[تێبینی] برایان موسڵمان وەك حەزرەت (د.خ) ڕوونی كردۆتەوە جوێن دان بە دایك و باوك لەڕیزی گوناهە گەورەكان دانراوە.وە هەر كەسێك ئازاریان بدات وە دڵیان بەرنجێنێت ئەمە ژمێردراوە لە تاوانە گەورەكان بەڕای زاناكان .

# تاوانی نۆیەم

# تەرك كردنی هاتوچۆی خزمان

[هجر الأقارب] [أو قاطع الرحم]

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت [واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام] سورة النساء آية (١) واتە [ئێوە خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کەخوا لەئێوەی قەدەغە کردووە هەروەها داوای هەموو پێویستی‌یەکی لێ دەکەن وە ئاگاداری بەجێ هێنانی مافەکانی خزمان بکەن و هاتوچۆیان بکەن] وە قورئان ڕێ نمایمان دەکات و لە خەوی بێ ئاگایی ڕامان دەچڵەکێنێ دەربارەی دات و چۆ نەکردنی خزم و کەسایەتی هەروەك خوا لەو ئایەتەدا بە توندی باسی ئەم بابەتە دەکات کەوا دەفەرموویت [فهل عسيتم ان توليتم ان تفسدوا في الارض و تقطعوا ارحامكم أولئك الذين لعنهم الله فاصمهم واعمى ابصارهم] سورة محمد آية (٢٣) واتە [ئەوانە لەو کەسانەن ئەگەر پێیان هەڵکرد بکەونە خراپەکاری لە زەویدا و هاتوچۆی خزمان ناکەن ئەوانەن خودا لەعنەت و نەفرینی لێ کردون چونکە پێشوازی ئەم ئاینە پاکەیان نەکردووە وە سودیان لێ وەرنە گرتووە هەر وەك گوێیان لەم بانگە نەبووبێ و کەڕ بووبن

وەچاویان ئەی دیبێو کوێر ببن] لە ئەبو هورەیرە خوالێی رازی بێت ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ص) [قال ان الله تعالی خلق الخلق حتی اذا فرغ منهم قامت الرحم فقالت هذا مقام العائذ بك من القطيعة قال نعم اما ترضين ان أصل من وصلك وأقطع من قطعك؟قالت بلی قال فذاك لك ثم قال رسول الله (ص) أقرءوا إن شئتم فهل عسيتم إن توليتم ان تفسدوا في الارض وتقطعوا ارحامكم] متفق عليه واتە [خوای دروسنکارکاتێ لە دروست کردنی مرۆڤ بۆوە پاشــان (گیان) هەستاو ووتی ئێستا کاتی ئەوەیە مرۆڤ پەنا بۆتۆ بێنێت لە هاتو چۆ نەکردنی خزمان ئینجا خوای دروستکار فەرمووی بەڵی ئەی (گیان) (رحم) هەر کەسێك هاتو چۆی بکات من بەزەیم پیا دێتەوە هەر کەسێك هاتو چۆت نەکات من بەزەیم پیا نایەتەوە ئایا بەوە رازیت ئینجا گیان (رحم) ووتی بەڵێ رازیم خوا فەرمووی ئەو فەرمانەم بۆ تۆ پاشان پێغەمبەرّ (د.خ) فەرمووی ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە [فهل عسيتم إن توليتم ان تفسدوا في الارض وتقـطعـوا ارحامكم ... الخ] هەروەها حەزرەت (د.خ) دەفــەرمــووێت [من كان يؤمن بالله واليـوم الاخر فليكـرم ضيفه] واتە [هەر کەسێ بروای بەخواو بەرۆژی دوایی هەیە بارێزی میوانی بگرێت] وە لە بەشی دووەمی فەرمــودەکــە دەفــەرمووێت [ومن كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليصل رحمه] واتە [هەر کەسێك بروای بەخواو بە

ڕۆژی دوایی هەیە باهاتوچۆی خزمان بکات] وە لە بەشی بێیەمی فەرموودەکەدا دەفەرموویت [ومن کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلیعمل خیراً او یصمت] رواه البخاري واتە [هەر کەسێ بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە باقسەیەکی چاکە بکات یان بێ دەنگ بێت] وە لە فەرموودەیەکی تردا حەزرەت (د.خ) [لا یدخل الجنة قاطع رحم](متفق علیه)واتە هەر مرۆڤێکی موسڵمان بە ئەنقەست پەیوەندی لە خزم و کەسی ناچێتە بە هەشت ].

وعن علي بن الحسين رض الله عنهما انه قال [لوالده یا بني لا تصحبن قاطع رحم فاني وجدته ملعوناً في کتاب الله في ثلاثة مواضع] بڕوانە الکبائر لاپەڕە (٤٥) واتە علي کوڕی حوسەین (خوایان لێ ڕازی بێت) ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکردو دەیگوت [کوڕم نەکەیت هاوڕێیەتی ئەو کەسە بکەیت کە خزمانی بەسەر ناکاتەوە من دیومە لەسێ جێگادا قورئان نەفرەتی لێ کردوون .

[سەرنجێک] تەرک کردنی هاتوچۆی خزمان بەوشەی عەرەبی پێ ئەڵێن (قطع صیلة الرحم) بڕیتی پەیوەندی خزمایەتی لە گوناهە گەورەکان دەژمێردرێ چونکە ئیمامی (قرطبي) دەفەرموویت بەکۆمەڵو ڕای زاناکان سەردانی خزموو کەس (فەرزە) واتە پێویستە هیچ کاتێك نابێ وازیان لێ بێنی مەگەر بە بەڵگەی شەرعی نەبێت.

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت [ولا تقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلاً] سورة الاسراء آية (٣٢) واتە [نزیك مەکەنەوە لە (زنا) چونکە ئیشێکی زۆر خراپەو لە گشت ڕێگەیەك خراپترە] خوای گەورە بەتەواوی باسیی داوێن پیسی کردووە بە گونــاهێکی زۆر ناشـــرین ناوی بردووە وەئــەو کەســەی کە ئەو ڕێگــایــە دەگــرێتــە بەر خراپترین مرۆڤە وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت [الزانية والزاني فاجلدوا كل واحـدٍ منهما مئة جلدةٍ] واتە [ژن و پیاوی کەداوێن پیسی دەکەن هەر یەکێکیان سەد داریان لێ بدەن] پاشان دەفەمووێت [ولا تأخذكم بهما رأفة في دين الله] واتــە [بــەزەیتــان بەو جۆرە کەسانەدا نەیەتەوە کە فەرمانی خوا بە فێرۆ ئەدەن [إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الاخـر وليشهـد عذابها طائفة من المؤمنين] سورة النور آية(٢) واتە ئەگەر ئێوە باوەرتان بەخواو بەرۆژی دوایی هەیــە وەپێــویستە کۆمەڵێك لە موسڵمانان ئامادە بن لەم شوێنەدا بۆ ئەوەی ئامۆژگاری وکەڵك وەربکرن لەم کردەوە خراپە [زاناکانی ئایینی ئەڵێن ئەو سزایە بۆ ئەو کوڕو کچانە کەوا کورەکــە ژنی نەهێنابێ‌و کچەکەش شووی نەکردبێ هەریەکێك لەمانە سەد داری لێ ئەدرێت بەڵام ئەگەر ژن و

پیاو لە تەمەنیان جارێك ژنەكە شووی كردبوو یاخود پیاوەكە جارێك ژنی هێنابوو ئەوا پێویستە بەرد باران بكرێن] لە ئەبو هورەیرەوە (ر.خ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەفەرمووێت [ لایزنی الزانی حین یزنی وهو مؤمن ] متفق علیه تاكوتایی فەرموودەكە واتە [ئەو كەسەی داوێن پیسی دەكات لەكاتی داوێن پیسیدا باوەڕی نامێنێت ] حەزرەت (د.خ) لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرمووێت [مامن ذنب بعد الشرك بالله اعظم عند الله من نطفة وضعها رجل في فرج لا یحل له] رواه الامام احمد واتە [لە پاش هاوبەش بۆ خودادانان هیچ تاوانێك لەوە گەورەتر نییە كە پیاوێك ئاوی پیاوەتیو ئارەزووی خۆی بەكار بهێنێت لە شوێنێكدا كەبۆی دروست نەبێت] حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێت [یا معشر الناس اتقو الزنا فأن فیه ست خصال ثلاثاً في الدنیا وثلاثاً في الآخرة أما التي في الدنیا فیذهب البهاء ویورث الفقر وینقص العمر أما التي في الأخرة فسخط الله وسوء الحساب وعذاب النار] رواه البیهقي و السیوطي واتە [ئەی كۆمەڵی موسڵمانان خۆتان لە (زنا) واتە داوێن پیسی بپارزێن چونكە شەش سیفەتی تێدایە سیانیان لە دونیاداو سیانیان لە ڕۆژی دواییدا ئەو سێ سیفەتەی لەدونیادا ئەمانەن ڕوناكی ئیسلام لە ڕووی ئەو كەسە دەبات وەلەلای خەڵك سووك و ڕیسواو بێ نرخە هەژار دەبێت و ماڵ و سامانی بەرەو كەمی دەچێت

تەمەنی کورت دەبێ و یاخود چاکەو خۆشی لە تەمەنی خۆی نابینێت وە ئەو سێ سیفەتەی کە لە رۆژی دواییدا لێی پەیدا دەبێت ئەمانەن خوا لە خۆی دەرەنجێنێت لێ پرسینەوەیەکی خراپی لەگەڵ دەکرێت و ئێشو ئازارێکی زۆر دەدرێ لەئاگری دۆزەخ] لە ئەبو هورەیرە (ر.خ) دەگێردرێتەوە کە پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێت [إذا زنى الرجل خرخ منه الايمان فكان عليه كالظلة فاذا أقلع رجع اليه الايمان] رواه ابو داود [واتە ئەگەر یەکێك داوێن پیسی کرد خوا بڕوایی لە دڵدا دەردێنێ بڕواکەی وەك سێبەر لە سەری رادەوەستێ و سێبەری لێ دەکا کاتێ وازی لە داوێن پیسی یەکە هێنا بڕواکەی دەچێەوە ناو دڵی]

[تێبینی] داوێن پیسی بەکۆمەڵ و رای زانایان لە تاوانە گەورەکان دەژمێردرێت هەروەك لەهەندێك فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بە پێش چاوەمان کەوت کەوا (زنا) بەگەورەترین گوناە ژمێردراوە هەندێك لە زاناکان دەڵێن داوێن پیسی لە کوشتنیش گەورەترە چونکە دەڵێن لەپاش هاوبەش دانان بۆ خوا داوێن پیسی یە بەڵام ئەوەی راست بێت ئەوەیە کە (شیخ ابن الحجر) دانی پیا هێناوە کە دەڵێت ئەوەی راسترین بێت لەپاش هاوبەش دانان کوشتنی بە ئەنقەستە پاش گوشتن داوێن پیسی یە بە تایبەتی ئەو داوێن پیسیەی کە لەگەڵ دراوسێ دەکرێت ـ بڕوانە الزواجر ـ بەرگی دووەم.

خوا دهفـەرمووێ لە قورئاندا[أتأتون الذكران من العاملين وتذرون ما خلق ربكم من أزواجكم ؟ بل أنـــتم قوم عادون]ـ سورة الشعـراء ايـة ٢٦ واتـە [ئـايا ئێوە ئەوەندە لە یاسای رەوشت و ئاین لادەدەن کە دەچنە لای مرۆڤی نێرینـــەو واز لەوانــە دەهێنن کە خودا بۆی حەڵاڵ کردون لە ژنەکانتان ؟وادیارە ئێوە نەتەوەیەکی لە یاسای خودا دەرچوون و لاتان داوە] لە جابری کوری عەبدوڵاوە (خ.ر) دەگەرێتەوە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەفەرمووێت [إن أخـوف ما أخـاف على أمتي من عمـل قوم لوط ]ـ رواه التـرمـذي وابن ماجه ـ واتە [لەهەموو شتێ زیاتر لێی دەتـرسم کە تووشی ئوممـەتەکەم بێت کردەوەی گەلی لوطە (واتە نێر بازیيە)] حەزرەت (د.خ)دەفەرمووێ [من وجد تموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به] واتە [لەهەر شوێنێك بینیتان کردەوەی گەلی (لوط) کرا کارەکەرو

کارلێکراو بگوڕن] پێغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت [أربعة يصبحون في غضب الله ويمسون في سخـط الله قلت من هم يا رسول الله؟قال المتشبهون من الرجال بالنساء والمتشبهات من النساء بالرجل والذي يأتي البهيمـة والذي يأتي الذكر (يعني اللواط) رواه البيهقي والطبـراني واتـە [چـوار کەس سبەینان و ئێواران لەناو قەهرو تورەیی خوادان] (ابو هريرة) خوا لێی رازی بێت دەڵێت [ووتم ئەو چوار کەسانە کامانەن ئەی پێغەمبەری خوا؟فەرمووی ئەو پیاوانەی خۆیان دەبەنە سەر شێوەی ژنان وەئەو ژنانەی خۆیان دەبەنە سەر شێوەی پیاوان ئەو کەسەی نزیکی چوار پێ بکەوێت بە تایبەتی گوێ درێژ وەئەوەی دەچێتە لای پیاو (واتە نێر بازی دەکات) :

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێت [لا ينظر الله عزو جل الى رجل آتى رجلا أو أمرأة في دبرها] رواه امـام التـرمزي واتە خوای گەورە بەچاوی بەزەیی تەماشای ئەو پیاوانە ناکات کە دەچنە لای پیاو یاخود لە پشتەوە دەچنە لای ژنان وەلە ریوایەتی پێشوودا امامی احمد دەفەرمووێت [ملعون من آتى امرأة في دبرها] واتە لەمیهرەبانی خوا دوور خراوەتەوە ئەو پیاوانەی لە پشتەوە دەچنە لای ژنان وەحەزرەت (د.خ) لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت [لعن الله من عمل عمل قوم لوط ورددها ثلاثاً]

رواه النسائي ـ واته [خوا نەفرەتی کردووە لە کەسانێك کەلەسەر رەفتاری ئەوەی (لوط) دەڕۆن وەسێ جار لە سەریەك ئەوەی دووبارە کردۆتەوە وە دەگێڕدرێتەوە لە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی [سبعة يلعنهم الله تعالى ولا ينظر اليهم يوم القيامة ويقول ادخلوا النار مع الداخلين] واتە خوا نەفرەتی لە حەوت مرۆڤ کردوە وەخوا بەچاوی بەزەیی تەماشایان ناکات وەفەرمان دەکات کەبیان کەنە دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەی کە دەچنە ناو ئاگر بە نەمری و هەتا هەتایە [الفاعل والمفعول به (يعني اللواط) وناكح البهيمة وناكح الأم وبنتها وناكح يده إلا أن يتوبوا] رواه الطبراني واتە ئەوانەی دەچنە لای نێر یاخود مێ لەپاشەوە وەئەوانەی دەچنە لای چوار پێو وەئەوانەی دەچنە لای دایك و کچ وەئەوانەی بە دەست خۆیان رەحەت دەکەن بەڵام ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە پەشیمان ببنەوە لە تاواناکانیان خوا لێیان خۆش دەبێت]

[تێبینی]هەموو زاناکان لەسەر ئەو رایەن کەوا نێربازی لەتاوانە گەورەکانە زانایان زۆر بیرو رایان هەیە دەربارەی ئەم کردەوە ناشیرنە هەندێك دەڵێن دەبێ دارکاری بکرێن وە هەندێکیان دەڵێن دەبێ بەرد باران بکرێن وەهەندێکیان دەڵێن دەبێ (سەرکەوت و بنکەوت)بکوژرێن وە ئیمامی (شافعیش) (ر.خ) دەڵێت پێوستە سەرکەوتو بن کەوتوو

بکوژرین بەڵام کوشتنەکەی دەبێت لەبەرزاییەکەوە هەڵبدرێتەوە خوارەوە یان دیوارێکی بەسەر بروخێن [بەڕێز حافظ المنذری ] دەڵێت چوار خەلیفە ابوبکروعلیو عبد الله بن الزبیر وهشام بن.عبدالملك خوایان (لێ رازی بێت) نێر بازیان بەئاگر سووتاندووە بەڵام لەکتێبی شەریعەتدا دەڵێت [نابێت هیچ گیان لەبەرێك بەئاگر بسوتێنرێت چونکە ئێش و ئازارێکی زۆری تێدایە] بەڵام ئەم (خەلیفانە) ئەو شتەیان کردووە بۆ ئەوەی ببێ بە پەندو ئامۆژگاری بۆ خەڵك.

خوا دەفەرمووێت [الذين يأكلون الربا لايقومون إلا كما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس] سورة البقرة ئایەتی ۲۷٥ واتــە [ئــەو کەسانەی کە سوو وەردەگرن بەنارەوا ماڵی خەڵك دەخۆن لێی پەشیمان نابنەوە ئەوانە راست نابنەوە لە گۆڕ بۆ پرسیارو پاداشتی دوا رۆژ تەنها بەشێوەی شتێك کە شەیتان دەستی لێ وەشــاندبێ شێت بووبێ خوا دەفەرمووێ [یا ایها الذين امنوا اتقوا الله وذروا مابقى من الربا إن كنتم مؤمنين فأن لم تفعلوا فأذنوا بحربٍ من الله ورسوله]

سورة البقرة ئایەتی ۲۷۹ـ واتە [ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان بەخودا هێناوە لە خودا بترسن و وازبهێنن لە سوو خواردن ئەو سووەی ماوەتەوە لەسەر خەڵك ئەگەر خۆتان بەمــوسڵمــان دەزانن ئەگــر واز ناهێنن لە سوو خواردن هۆشیار بن بۆ شەڕکردن لەگەڵ خوداو پێغەمبەر لە دونیاو ڕۆژی دواییدا].

(شێــخ ابن الحجــر)(ڕ.خ)دەفەرمووێ (سوو سێ جۆرە) یەکمیان پێی دەووترێت [ رباالفضل)ودووەم پێی دەووترێ (ربا اليد)و سێیەمیان پێی دەووترێ (ربا النسا )] ئەم جۆرە سووانە هەموویان دروست نین و مایەی تاوانبارین [1] وەهەروەها حەزرەت درووودی خوای لەسەر

---

(۱) [ربــا] لەزماندا بەمانا زیادەیە وە لە شەرعدا بەمانای زیادە لە ماملەیە لە تۆڵەی (ماڵا) لەکاتی ماملە کردن بەمەرجێك مامەڵەکە یەك جۆر بێت.

بێت دەفەرموویت [لعن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) آكل الربا وموكله وكاتبه وشاهديه وقال هم سواء] رواه مسلم وابو داود والترمذي واتە [پێغەمبەری خوا نەفرەت و لە عنەتی کردووە لە سوو خۆرو لە وەکیلەکەی لەوەش کە

پەیمـانی هەردوو لا دەنـوسێتـەوە لە گەواهی یەکـانی (شـاهدي) فەرمووی ئەمانە هەموویان وەکوو یەك گوناه بارو تاوان بارن] وە پێغـەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەکی

تردا دەفەرمووێت [إذا ظهر الزنا والربا في قرية فقد احلوا بانفسهم عذاب الله] رواه الحاكم وقال صحيح الاسناد

واتە [ئەگەر بەئاشکرا داوێن پیسی کراو سووخوراو لەهەر شارو دیهـاتێکـدا ئەوا سزای خوایـان لەسـەر خۆیـان سەپاندووە پێغەمبەری خوا دروودی خوای لە سەر بێت لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت [اياك والذنوب التى لا تغفر الغلول (السرقة في المغنم) فمن غل شيئاً أتي به يوم القيامة وآكل الربا فمن أكل الربا بعث يوم القيامة مجنوناً يتخبط ثم قرأ (الذين يأكلون الربا لا يقومون إلا كما يقوم الذين يتخبطه الشيطان من المس) رواه الطبراني واتە [خـۆتـان بپارێزن لەو تاوانەی کەخوا لێی خۆش نابێت مەگـەر پەشیمان بێتەوە لەفرووفێل‌کردن لەوماڵەی لە غەزا

داچنگ دەکەوی وەهەر کەسێك فێڵ بکات چ بەدزی و چ بەفرو فێڵ بێت بەهەر شێوەیەك بێت دەبێ لەرۆژی دوایی بیهێنێتەوە وەئەو کەسەی سوو دەخوات لەرۆژی دوایی‌دا زیندو دەکرێتەوە بەشێتی و سەر لێ شێواوی] لەپاشان ئەو ئایەتەی خوێندوە [الذين يأكلون الربا لا يقومون الا كما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس] (ماناکەی لەگەل سەرچەمی ئایەتەکە لێکدراوەتەوە) لە عەبدولای کوری حەنزەلەوە (رض) دەلێت پێغەمبەر (در) دەفەرمووێت [درهم رباً يأكله الرجل وهو يعلم أشد من ستة وثلاثين زنية] رواه احمد والبطراني واتە [ئەو کەسەی یەك درهەم سوو بخوات لەگەلْ ئەوەش کە بزانێت خوا قەدەغەی کردووە ئەوە باری گرانترە لەئێش و سزای داوێن پیسێك بەسی و شەش جار.

[ تێبینی ] بەبیرو رای هەموو زاناکان (سوو) ربا خواردن بە تاوانە گەورەکان دەژمێردرێ و لەو تاوانانەیە کەمەروۆف دەفەوتێنێ وەکەسێك (ربا) واتە سوو خواردن بەرەوا [حەلاڵ] بزانێت ئەوا پێی (کافر دەبێ واتە بێ باوەر دەبێ و هەروەکوو لە زاواجری شێخ ابن و حەجەر دەفەرمووێ [ان الربا حرام اجماعاً وهو من الكبائر المهلكة وكفر مستحله] بروانە (الزواجر) لاپەرە ٢٢٨ بەرگی یەکەم.

# تاوانی سیانزده‌هه‌م

# خواردنی ماڵی هه‌تیوو سته‌م لێکردن

( أكل مال اليتيم وظلمــه )

خوا دەفەرمووێت [ان الذين يأكلون اموال الي
ظلماً انما يأكلون في بطونهم ناراً وسيصلون سعيراً] 
النساء آية ١٠ـ واتە [ئەو کەسانەی کەماڵی کە
باوك (هـەتیـوو) دەخـۆن بەستەم لەپاشەڕۆژێکی
دەخـرێتـە ناو ئاگـری بەگڕپـەو بڵێسـەی دۆزەخ
وەبەراستی پڕ بەسکی خۆیان ئاگری دۆزەخ دەخۆن
ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت [ولا تقربوا
اليتيم الا بالتي هي أحسن حتى يبلغ أشده] سورة الا
آيـة ـ١٥٢ـ واتـە لە پاشە ڕۆژێکی

[نزیکی ماڵ و سامانی هەتیو مەکەوە وەئـەگـەر نزیکی

کەوتن بەشێـوەیەك بێ کە مەبەستی ئاگـاداری کردن

بێو بێگەرد بێ هەتا ئاشنایان واتە بالغ دەبن و

بیرو هۆش پەیدا دەکەن لەبارەیانەوە] وەپێغەمبەر درود
خوای لێ بێت دەفـەرمـووێت [لە حەوت تاوانی فەوتێنە
نزیـك مەکـەونـەوە یەکێك لەمانە (اکل مال اليتيم) دا

خواردنی ماڵی هەتیو و بڕوانە ئەم فەرموودەیەی حەزرەت (د.خ) کەچ موژدەیەکە بۆ ئەو بڕوا دارانەی کەچاودێری هەتیوان ئەکەن دەفەرمووێت [انا وكافل اليتيم في الجنة هكذا وأشار بالسبابة والوسطى وفرج بينهما] رواه البخاري واتە من وئەو کەسانەی کە هەتیو دەگرنە لای خۆیان لە بەهەشتدا پێکەوەین وە پێغەمبەر (د.خ) دەست نیشانی ئەو شتەی کرد بەبڵند کردنی دوو پەنجەی پیرۆزی وەلە ئەبی هورەیرە کەناوی (عبدالرحمن)ە خوای لێ رازی بێت) ئەگێردرێتەوە لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەفەرمووێت [خير بيت في المسلمين بيت فيه يتيم يحسن اليه وشر بيت في المسلمين بيت فيه يتيم يساء اليه] رواه ابن ماجه واتە باشترین ماڵی موسڵمانان ئەو ماڵەیە هەتیوێکی لێ بێت و بۆی باش بن وەخراپترین ماڵی موسڵمانان ئەوماڵەیە هەتیوێکی لێ بێت و بۆی خراپ بن [**تێبینی**]خواردنی ماڵی هەتیوان بەبیروڕای هەموو زانایان بەتاوانە گەورەکان دەژمێردرێت و مرۆڤ دەفەوتێنێ وەخواردنی ماڵ و سامانی هەتیو بە نارەواو کەم و زۆر یەك دەنکە گەنم بێت ئەگەر بەستەم بێت بە تاوانی گەورە دەژمێردرێت [خوای گەورە پەنامان بێت] .

## تاوانی چواردەهەم

# درۆکردن بە خواو پێغەمبەرو درۆ کردن لەکاتی قسەکردنی بەبێ هۆ

[الكذب على الله ورسوله (ص) والكذب في غالب ...

خوا دەفەرمویٚت [ویوم القیامة تری الذین کذبوا علی الله وجوههم مسودة] سورة زمر آیة ٦٠ـ واتە ئەوانەی درۆیان بۆ خودا هەڵبەستووەو ئەڵێن خودا ئەوەی کچ و کوری هەیە (یان هاوبەشی هەیە) لە رۆژی دواییدا ئەیان بینێن کە چۆن زوویان وەك قیر رەشە لەبەر باری خودادا پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویٚت [من کذب علیّ متعمداً فلیتبوأ مقعده من النار] متفق علیه واتە [هەر کەسێك درۆ بەزمانی منەوە هەڵبەستێ جێگایەك لە دۆزەخدا بۆی تەرخان دەکریت] چونکە درۆ دوو جۆری هەیە یەکەمیان تاوانی گەورەترە لە دووەمیان لە هەموو درۆیان گەورەتر ئەوەیە کەدرۆ هەڵبەستی بەناوی خواوە بەناوی پێغەمبەرەوە وەك حەزرەت (د.خ) دەفەرموویٚت [ان کذباً علي لیس ککذب علی احد فمن کذب علي متعمدا فلیتبوا مقعده من النار] رواه مسلم واتە [بەراستی درۆ هەڵبەستن بەناوی منەوە وەك ئەو درۆیە نییە کەبەناوی

یەکیکی ترەوە هەڵدەبەستریٚ هەرکەسیٚك درۆ بەزمانی منەوە هەڵبەستی جێگایەك بۆخۆی تەرخان دەكات لە ئاگری دۆزەخدا] خوای گەورە دەفەرمووێت [إن الله لا يهدي من هو كاذب كفار] سورة الزمر آية -٣- واتە بەراستی خوارێگای راست نابەخشیٚ بەو کەسانەی کە درۆزن و بیٚ باوەرن وە دەفەرمووێت [فنجعل لعنة الله على الكاذبين] سورة آل عمران آية ٦١- واتە [ئاگادار بن خودا نەفرەتی کردوە لەو کەسانەی کەدرۆزنن] پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێت [اذا كذب العبد تباعد الملك عنه ميلاً من نتن ماجاء به] رواه الترمذي واتە [ئەگەر بەندەیەك درۆی کرد فریشتەی خوا هێندەی یەك میل لیٚی بەدووره لەبەر بۆگەنی دەم و زاری ئەو بەندە درۆزنە] وە حەزرەت (د.خ) دەفەرمووێت لە فەرمودەیەکی تردا [كبرت خيانة أن تحدث أخاك حديثاً هو لك مصدق وأنت له به كاذب] رواه ابو داود واتە گەورترین خیانەت ئەوەیە کە تۆ قسەیەك بۆ برای خۆت بکەیت و ئەو بروات پیٚ بکات و تۆش بزانی درۆیە] لە ئەبی هورەیرە دەگێڕدرێتەوە خوای لیٚ رازی بێت دەفەرمووێت [آية المنافقين ثلاث اذا حدث كذب واذا وعد أخلف واذا أؤتمن خان] متفق عليه واتە [نیشانەی ناپاکان و دووروان سیٚ شتە ئەگەر قسەی کرد بەدرۆ بیکات وە ئەگەر بەڵێنیٚك بدات و بیشکێنیٚت وە ئەگەر راسپار دەیان لەلا دانا و خیانەت بکات] وە حەزرەت (د.خ) لە

فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت

[ویل للذي یحدث بالحدیث لیضحك به القوم فیکذب ویل له ویل له] رواه الترمذي واته قور بەسەری و سزا بۆ ئەو کەسـەیـە کەدرۆ دەکـات وقسەو قسەلۆك هەڵدەبەستێ بەدرۆ بۆ ئەوەی خەڵك پێی پێکـەنن سێ جار ووشـــەی (ویـــل) دووبـــارە کردۆتـــەوە [تـێـبـیـنـی] درۆکـــردن تاوانێکی گەورەیــە زەرەروو زیانی ئاین و دنیای هەیە سەرچاوەی هەموو تاوێکە وەلە کیتابی (زواجر) دادەنێت گەورەترین درۆ ئەوەیە بەڵای هەندێ زانایان°درۆ هەڵبەستن بەناوی خواداو پێغـــەمبـــەرەوە بێ°ئەوە گومـــراهی‌یـــە کە مرۆڤ دەترازێنی لە ئاینی ئیسلام

خوا دەفەرمویت [ومن یولهم یومئذٍ دبرهُ الّا متحرفاً لقتال أو متحیزاً إلیٰ فئةٍ فقد باءَ بغضبٍ من الله ومأواه جهنم وبئس المصیر]سورة الانفال آیة ١٦ـ واتە هەر کەسێك لە رۆژی گەیشتن بەبێ باوەڕاندا پشتیان تێبکات و بگەڕێتەوە بەبێ ئەوەی پیلان و فێڵ بێت هەتا لەلایەکی دیکەوە ڕێگا لە دوژمن بگرێت ئەوە بەڕاستی خودا لێی دەرمنجێ و جێگەشی هەردۆزخەو دۆزەخیش خراپترین جێگایە ] لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێردرێتەوە کەپیغەمبەر (د.خ) دەفرموێت [اجتنبوا السبع الموبقات قالوا یارسول الله وماهن؟ قال الشرك بالله والسحر وقتل النفس التی حرم الله الا بالحق واکل مال الیتیم والتولی یوم الزحف وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات] رواه البخاری ومسلم واتە [خوتان بپارێزن لە حەوت تاوانی فەوتێنەر فەرموویان یا رسولالله ئەو تاوانە کامەن؟ فەرمووی هاوبەشی بۆ خودا دانان و جادوو نەفسێ کەوا خوا کوشتنی ئەوی حەرام کرد

بێ بەناحەق وە خواردنی ماڵی هەتیوو سوود خواردن،لە ڕۆژی حەربا لە جەنگ ڕاکردن درۆ هەڵبەستن بەسەر ئەو ژنە پاکە موسڵمانانەی کە ئاگایان لە هیچ نی یە.[سەرنجێك]لە (زواجر)دا ئیمامی شافعی (ر.خ) دەفەرمووێت ئەگەر موسڵمانەکان جەنگیان کردو پاشان تووشی بێهێزی هاتن لەلایەن دوژمنەوە ئەوە قەدەغەکراوە لەسەریان پشت لەپاش کەن و هەڵێن تەنها ئەگەر بەشێوەیەکی پیلان نەبێت و بەفێڵ خۆیان نشکێنن وپاشان بگەڕێنەوە لای هاوڕێکانیان وە دەفەرمووێت ئەگەر بێت و گاورەکان زۆرتربن لە موسڵمانەکان دیسان باش نی یە ڕابکەن وەئەگەر ڕاشبکەن بەرەنگاری سزای خوا نابن بەلای منەوە چونکە هەلاتن لەڕیزی غەزادا بەو مەرجەی نیو مەندەی گاوران یان زیاتر بن بەڵام ئەگەر کەم تربن لە ژمارەی دوژمنی ئیسلام هەڵاتن و کۆڵ دان قەدەغە نی یە - بڕوانە پەرتووکی (الزواجر) لاپەرە ١٧٢ بەرگی دووەم.

## تاوانی شانزەهەم

# ناپاکی و ستەم کردنی پێشەوا بەرامبەر گەلەکەی

[غش الامام الرعية وظلمتهم]

خوا دەفەرموویت [ولا تحسبن الله غافلا عما يعمل الظالمون إنما يؤخرهم ليوم تشخص فيه الابصار] سورة ابراهيم آية ٤٢ واتە [وا مەزانە کە خوای گەورە بێ ئاگایە لە کردەی خراپ و ستەمی ستەمکاران بەڵکو خوا بەدوایان دەخات بۆ ڕۆژێك کەلەترسا چاویان لە مۆڵەق ڕاوەستێ و سەرسام دەبن خوای گەورە دەفەرموویت [وسيعلم الذين ظلموا أي منقلب ينقلبون) ـ سورة الشعراء آية ٢٢٧ـ

واتـە [لەمەولاش ئەو ستەم کارانە دەزانن و چاویان پێ دەکەوێ بەچ هەڵ سورانێ هەڵدە سووڕێن و لە چ بارێکی بەرزیەوە دەکەونە سەرباری کزیو داماوی‌و لەسەرباری بـواردنی دنیاوە دەکەونە سەر چ بارێکی سزای ڕۆژی دوایی وە لەعەبدوڵای کوری عومەرەوە (ر.خ) دەگێردرێتەوە کەحـەزرەت دەفـەرمـوویت [الظلم ظلمات يوم القيامة]ـ

متفق عليه ـ واته [زلم و ستەم تاریكایی‌یە لەرۆژی دواییدا وەهــەروەهــا لەفەرمووـ دەیەكی تردا دەفەرمویت (د.خ) [كلكم راعٍ وكلكم مسؤل عن رعيته ] متفق عليه ـ واته [هەریەك لە ئیوە شوانەو بەر پرسیارە لەوەی كەلەژیر چاو دێـریـدایـە ]وە پیغەمبەر (د.خ) لە فەرموودەیەكی تردا دەفـەرمـوویت [مامن عبدٍ يسترعيه الله رعية يموت يوم يمـوت وهو غاش لرعيته إلاحرم الله عليه الجنة ]ـ متفق عليهـ واتـە [هیچ بەندەیەك نی‌یە كەخوا بیكا بە شوانی كۆمەلێك و فێلیان لەگەل بكاو بمری لەو وژەدا كە ئەمری بێ گومـان خوا بەهــەشتی لێ قەدەغـە دەكات [تێبینی] ئەوەش دانـراوە بەگـوناهە گەورەكان ئەگەر پێشەوایەك گزیو خیانەت بكاو لەگەل كەلو میللەت بەلام ئەگەر هەر سەروك و پیشەوایەك بەیەكسانی بجولێتەوە پاداشی بەهیچ جۆریـك تەواو نابێت هەروەت حەزرەتی پیغەمبەر (د.خ) دەفەرموویت [يوم من إمام عادلٍ افضل من عبادة ستين سنـةٌ ]ـرواه الطبـرانـي ـ واتـە[ پێـشـەوا رۆژێـك بەدادپـەروەری بجولێتەوە لە شەست سال خوا پەرستی باشترە واتە خواپەرستی [سونەت ].

خوای گەورە دەفەرموویت [كذلك يطبع الله على كل قلب[3] كل متكبـر جبار] سورة غافر آية ٣٥ واتە خوای گەورە مۆری ناوە بەدڵیـان و رووبـاکی دادپەرستی ناڕواتە ناو دڵیانەوە لەبەر دەمارگیری و خۆبەزل زانین و ستەمکاری و گاڵتە پێ کردن بەئاین. وە هەرکەسێ خۆی بە زل بزانێ و ستەمکار بێت بێگومان ئەوانە خودا مۆردەنێ بە دڵیانا وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت [ان الذين يستكبرون عن عبادتي سيدخلون جهنم داخرين] سورة غافر آية ٦٠ واتە [ئەو کەسانەی کە خۆیان بەگەورەو زل دەزانن لەئاست بەندەی مندا ئەبێ لەمەولا مل کەچ بکەن و بەدەماوی بچنە ناو دۆزەخەوە] لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت [انه لا يحب المستكبرين] سورة النحل آية ٢٣ واتە [بەراستی خودا خاوەن دەمـارو بەفیـزەکـانی خۆش ناویت] وە ئایەتیش لەباری سەرزەنشتی فیزەوە زۆرن وە هەروەها پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویت [ لا يدخل الجنة من كان في قلبه

مثقال ذرّةٍ من كبر فقال رجل إن الرجل يحب ان يكون ثوبه حسنا ونعله حسنة قال ان الله جميل يحب الجمال الكبر بطر الحق وغمط الناس] رواه مسلم والترمذي واته [هەر كەسێ هێندەی‌یەك خەردەل فیزی لە دلدا بێت ناچێتە بەهەشت پیاوێك ووتی یەكێك حەز دەكات جل و بەرگ و پێلاوی جوانی بێت پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی هەموو شتێكی خوا جوانەو مخوا هەموو شتێكی جوانی خۆش دەوێت] ئەبی هورەیرە (ر.خ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ص) دەفەرموویت [بینما رجل یمشي في حلة تعجبه نفسه مرجل رأسه یختال في مشیته إذ خسف الله به فهو یتجلجل في الارض إلى یوم القیامة] متفق علیه واته [لەسەر دەمی رابردوودا مرۆڤێك هەبوو بەرگی خۆی درێژ كردووە لەبەر فیزو خۆبایی بوون وسەری خۆی بەشانەُ داهێناوە ولە رۆیشتندا زۆر لە خۆبایی‌و بەفیز رۆیشتووە بەسەر زەویدا لەبەر ئەوە خوالێی رەنجاوەو نوقمی ژێر خاكی خستووە ئێستاش لە زەوی‌یدا دەچێتەوە خوارەوە هەتاكوو رۆژی دوایی خودالە قورئاندا دەفەرموێت [ولا تمش في الارض مرحاً ان الله لا یحب كل مختالٍ فخور] سورة لقمان آیة ١٨ واتە [بەسەر زەوی دا بەفیزو خۆبایی بوونەوە رێ‌مەكە چونكە خودا ئەو چەشنە كەسانەی خۆش ناوێت كەلوتیان بلندەو لەخۆیان بایی بوون] خوای گەورە لە فەرموودەیەكی [قودسی‌دا] لەسەر زوبانی پێغەمبەر (د.خ)

دەفەرمووێت [الكبرياء ردائى والعظمة إزاري فمن نازعنى واحداً منهماالقيته في النار] رواه مسلم واتە [گەورەیی و دەسەلات هەر بۆ خوایەو هەرکەسێك لەوانە بەربەرەکانێم لەگەڵ بکات فرێی دەدەمە ناو دۆزەخەوە.

[ روونکردنەوەیەك ]

لە بەر ئەوەی [الكبرياء ردائى والعظمة إزاري] واتە ئەو دووسیفەتە لە سیفەتەکانی خوان هیچ رەوانییە بۆ بەندەیەکی بێ هێزو بێ دەستەلات خۆی بەفیزو زل بزانێ واتە بەکورتی (رداو إزار) دوو پۆشاکن تایبەتن بە خاوەنەکەی خۆیان کەسی تر مافی نییە لەو دوو پۆشاکە هاوبەش بن لەبەر ئەوە ئەم دووسیفەتە هەرلایەقی خوان هەرکەسێ داوای هەر یەکێك لەمانە بکات واتە لەو دوو سیفەتانە خوافرێی دەداتە ناو دۆزەخ[سەرنجێك] ئەم تاوانەش واتە(فیزو لە خۆ بایی بوون) ژماردراوە لەتاوانە گەورەکان وە هەندێك لە زانایان دەفەرموون خراپترین فیز ئەوەیە کەفیز لەسەر خوای گەورە لێ بدەێت [پەنا بە خوا] هەر وەك فیرزلێدانی و لە خۆبایی بوونی (فیرعەون و نەمرورود) کە داوای خوایەتیان دەکرد [نعوذ باالله] ئەم جۆرە فیزو خۆبەزل زانینە مرۆڤ بێ باوەر (کافر) دەکات .

خوای گەورە دەفەرمووێت [والذين لايشهدون الزور] سورة الفرقان ٧٢ـ واتە [بەندەكانی خوا ئەوانەن گەواهی (شایەدی) بەدرۆ نادەن] وە لە ئایەتێكی تردا دەفەرمووێت [واجتنبوا قول الزور] ـ سورة الحج آية ٣٠ ـ واتە [خۆتان بپارێزن لەگەواهی دان بەدرۆ واتە (شایەدی) بەدرۆ] [ئەبو بكر]ە خوای لێ رازی بێت دەگێڕێتەوە دەڵێت دانیشتبوین لە لای پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی [الا انبئكم باكبر الكبائر قلنا بلى يا رسول الله قال الاشراك بالله وعقوق الوالدين وشهادة الزور أو قول الزور وكان رسول الله (ص) متكئاً فجلس فما زال يكررها حتى قلنا ليته سكت] ـ متفق عليه ـ واتە [خەبەردار بن خەبەرتان بدەمێ شێوەی گەورەترین تاوانتان پێ راگەیەنم هاوەڵەكانی ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی هاوبەش دانان بۆ خوای تاك و تەنیاو ئازاردانی دایك و باوك گەواهی دان بەدرۆ هەتا سێ جار ئەوەی ووتەوە یەكەم جار پاڵی دابۆوە

پاشــان هەستاوە دانیشت و هەر دەیفەرموو گەواهی‌دان بەدرۆ چەند جار ئەوەی دووبارە کردەوە ئێمەش گوتمان خۆزگە بێ دەنگ دەبوو] حەزرەت درووودی خوای لەسەر بێت لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموویت [من کتم شهادة اذا دعي اليها كان كمن شهد بالزور] ـ رواه الطبراني ـ واتە [هەر کەسێ شایەدی نەدا کە بانگیان کرد بۆ شایەدی بەمــەرجێــك شایەدی‌یەکەش لەلای بێو نەیدا واتە مافی موسڵمانێك بفەوتێنێ هەروەك شایەدی بەدرۆی دابێ وایە (ئەبی هورەیرە) (ر.خ) دەڵێت گوێم لە پێغەمبەر بوو (د.خ) دەیفــەرموو [من شهد على مسلم شهادةً ليس لها بأهل فليتبــوء مقعده من النار] ـ رواه احمد ـ واتە هەر کەسێ شایەدی بدات لەسەر موسڵمانێك شایەدی‌یەکی وابەدرۆ بەبوختان بێت باجێگایەك ئامادە بکات بۆ خۆی لە دۆزەخ.

[**تێبینی**]زاناکان دانیان بەوە ناوە کە شایەدی دان بەدرۆ لەتــاوانە گەورگان دەژمێر درێت بەمەرجێك شایەدی‌یەکە بوختــان بێت لەبــەر ئەوە خواو پێغەمبەری خودا ئەومیان قەدەغە کردووە

خوا دەفەرمووێت [يا أيها الذين أمنوا إنما الخمر والميسر والانصــاب والازلام رجس من عمــل الشيــطان فاجتنبــوه لعلكم تفحلون] ـ سورة المائدة اية ٩٠ ـ واته [ئەی ئەوانەی خاوەن باوەرن مەی خواردنەوەو قومارو بت پەرستــیو تیر گرەوکـردن کردەوەو کارێکی پیسن و لە کردەوەی شەیتــانن خۆتــان بپارێزن و تاکو خوا سەرتان بخات و رزگارتان بکات] پاشان دەفەرمووێت [انما يريد الشيــطانُ ان يوقــع بينكم العــداوة والبغضاء في الخمر والميسر وَيَصــدكم عَن ذِكــر الله وعن الصــلاة فَهَل انتم منتهــون[1]] واتــە [شەیتان دەیەوێت ناکۆکی و دژایەتی بخاتە نێوانتانەوە بەهۆی سەرخۆشیو قومارەوە وەلەیادی خوا دوورتــان بخاتەوە ئیتر بەسە دەست هەڵ گرن لەم کردەوانە پێغمبەر (د.خ) دەفەرمووێت لە فەرموو دەیەکا [اجتنبوا الخمر فأنها مفتاح كل شرٍ] رواه الحاكم والبهقى واتە [دوور بکەونەوە لەمەی خواردنەوە چونکە کلیلی هەموو

---

(١) سورة المائدة اية (٩١) قال الامام الرازي في تفسيره واعلم ان هذه الاية دالةٌ على تحريم شرب الخمر واتە ئیمامی رازی (ر.خ) ئەفــەرمــووێت پێویستە بزانن ئەم ئایەتە [دەلالەت] ئەکا لەسەر قەدەغــە کردنی خواردنەوەی (مەی) تەفسیری رازی بەرگی ١٢ لاپەرە (٨١).

خراپـەو ئاژاوەیـەکـە] هەروەهـا حەزرەت [د.خ] لە فەرمـوودەیـەکی تردا دەفەرمووێت [مَن كانَ يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يجلس على مائدةٍ يشرب عليها الخمر] ـ رواه الطبـراني ـ واتـە [هـەر کەسێـك باوەڕی بەخـواو بەڕۆژی دوایی هەیـە بالەسـەر مێـزی مەی خواردنەوە دانـەنیشێت] هەروەهـا ئیمـامی (طبـەرانی) درێـژە بەفەرموودەیەکە دەدات دەڵێت [مَن شَرِبَ حَسوةً من خمرٍ لَم يقبل الله منه ثلاثة أيام صرفاً ولا عدلاً (فرضاً ولانفلاً) ومَن شرَبَ كأساً لم يقبل الله صلاته اربعين صباحاً] واتە [هەر کەسێ قومێك مەی بخواتەوە خێرو چاکەی سێ ڕۆژی لەسەر یەك لێ وەرناگیرێ (چ واجب و چ سونەت) وە هەر کەسێك یەك پەرداغ عەرەق واتە مەی بخواتەوە چل ڕۆژ نوێژو خوا بەرستی لێ وەرناگیرێ مەگەر پەشیمان بێتەوە] وە حەزرەت دەفەرمووێت (د.خ) [ومدمن الخمر حقاً على الله ان يسقيه من نهر الخبال قيل يارسوالله (ص) وما نهر الخبـال؟ قال صديد أهل النار] ـ رواه الطبراني ـ واتە [کـەسێـك لەسـەر مەی خواردنەوە بەردەوام بێت ڕەوایە (حـەقـە) لە سەر خوا کەلە ڕووبـاری (خبال) تێری بکا فەرموویان ئەی پێغمبەری خوا ڕووباری (خبال) چی‌یە؟ فەرمـووی کێم و خوێناوی خەڵکی دۆزەخە] هەروەها لە فەرمـــوودەیـەکی ناوی ئەم کارە پیسـە ناونـراوە بە [أم الخبائث] وە ئیمامی عەلی (ر.خ) دەفەرمووێت [لوو قَعَتْ

قطرة من خمر في بئر فبنيت مكانها منارة لم أوذن عليها] واتـه [ئـهگـهر يهك دلۆپ مهى بكـهوێته ناو بيرێك وه له شوێنهكهى (واتا جێگاكهى) منارهيهك دروست بكرێت من بانگ لهسهر ئهم منارهيه نادهم] وهعهبدوڵاى كورى عومهر (ر.خ) دهيفهرموو [لو ادخلت أصبعي فيه لَم تتّبعني اي لقـطعتها] واته [ئهگهر بهنجهيهكم بكهوێته ناو عهرهقهوه نابێ ئهو پهنجـهيه لهگهڵ مندابێت هاورێيهتى ناكهم و دهى برمهوه[١]].

[ئـاگـاداريك]پێغمبهرى نازدارمان (د.خ) دهفهرمووێت [يشرب ناس من أمتي الخمر يسمونها بغير اسمِها[٢]] ـ رواه ابن ماجه ـ وه له ههندێ (ريوايهتا) ئهمهشى لێ زياد كراوه [يضرب على رؤوسهم بالمعـازف (ألات المـلاهي) والقنيات [أي المغنيات] يخسف الله بهم الارض ويجعل منهم القـردة والخنازير[٣]] واته [له ئومهتى من ههندێ كهس مهى دهخۆنهوه وه ناوى مهى دهگۆرن به ناوى تر

(١) بروانه (زاجر وارشاد العباد ل ١٤٠)

(٢)وابـزانم ئهمـهش موعجـزهيـهكى حهزرهتـه (د.خ) ئهمـهى فهرموومكه ئێستا به چهند جۆر ناويان له (عهرهق) مهى ناوى وهك بيرهو ويسكىو (شمبانياو) كونياك و (ڤۆدكا). ددوم بروانه پهراوى [الخطايا في نظر الاسلام] ل١٠٦ عفيف عبدالفتاح طبارة.

(٣)رواه ابن ماجه وابن حبار في صحيحه.

(وەك بیرە) بەسەر سەریانەوە مۆسیقای رابواردن لێ دەدرێو چەند ئافرەتێكی گۆرانی بێژ ئاوازیان بۆ دەڵێن لەبەر ئەوە دوور نی‌یە خوا نوقمی ژێر زەوی‌یان بكات و لە

ناویان ببات وەهیچ دوور نی‌یە خوای گەورە ئەوانە بگۆڕێ بە (مەیموون و بەراز) یاخود دڵ و دەروونیان شێوەو ئارەزووبازیان و رەوشتیان وەك مەیموون و بەراز لێ بكات لەبەر ئەوەی وا دەركەووتووە كە بەراز لەبارەی ئارەزوو بازی‌یەوە زۆر (جنسی‌یە) ئاینی پێغمبەر موحەمەد (د.خ) هەموو خواردن و خواردنەوەیەك كە مرۆڤ بێ هۆش بكات قەدەغەی كردووە ئەوەش لە جوانی ئاینی ئیسلامدایە[1] هەروەها پێغمبەر (د.خ) دەفەرموێت

[كل مسكرٍ خمرٍ وكلِ خمرٍ حرام] واتە [هەرشتێك سەرخۆشی بدات مەیەو وەهەموو مەیێكی خواردنەوەی قەدەغەیە وە دەفەرمووێت [كل شراب اسكر فهو حرام] -

(١)بروانە پەرتووكی [روح الدين الاسلامی] لاپەرە (٤٤).

متفق عليه ـ واته [هەر خواردنەوەیەك ئادەمیزاد مەست بكـات ئەوە قەدەغــەیــە] وە لە فەرمــوودەیــەكی تردا دەفەرمووێت [وما اسكرَ كثیره فقلیله حرام] ـ رواه ابو داود والترمذي ـ واته [ئەوەی كەم و زۆر مرۆڤ سەرخۆش بكات قەدەغەیە] **[تێبینی]** پێویستە بزانین مەی بابە ئەندازەی یەك دڵۆپ بێ خواردنەوەی قەدەغەیەو لە تاوانە گەورەكان دەژمێردرێت وەسزای مەی خۆریش چل دارە وەدروستیشە بگاتە هەشتادار بەمەرجێك پێشەوای موسڵمانان فەرمان بكات چونكە بەوجهێكی [تعزیز] دادەنرێت

خوای گەورە دەفەرمووێت [یاأیها الذین آمنوا إنما الخمر والمـسـیر والأنـصـاب والازلام رجس من عمـل الشیطان.....الی قوله تعالی فهل أنتم منتهون] ـ سورتی (المـائـدة) ئایـەتی ٩٠ـ [تـەفسـیری ئەم ئایـەتەش لە پێشەوەکرا] واتە [ئەی ئەوانەی خاوەن باوەرن قومار کردن رەفتـارێکی پیسـەو کاروپیشـەی شەیتانە] [ بەم جۆرە هەموو شێوەیەکی قومار قەدەغەیە وەك کاغەزو شەترەنج و دامـەکـردن و سێ رسکانیو دۆمینەو کلاوانێو فنجانێو گیزانێو هێلکانێو .. هتد] ئەگەر هاتوو ئەو جۆرە یارییانە لەسەر پارە بکرێت قەدەغەیە لە ئیسلام دا بەلام ئەگەر لە سەر پارە نەکرێت قەدەغە نییە بەمەرجێك کات و ئەرکی ئاینیت بەفـیرۆ نەبـات وەهۆی قەدەغە کردنی ئەم جۆرە یارییـەش ئەوەیـە هەروەك خوا دەفەرمووێت [ولاتأکلوا اموالکم بینکم بالبطال] ـ سورة البقرة آیة ١٨٨ ـ [واتە ماڵی یەکتر مەخۆن لەناویەکدا بەستەم و نارەواییو گەزافـ (وە شێـخ موحـەمـەدی خالیش) لە تەفسێرەکەی دەڵێت

قومـار زیانی یەکجار زۆرە یەکەم ئەوەیە کە دوژمنایەتی دروست دەکات

دووەم مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە نوێژو خواپەرستی سێیەم مرۆڤ فێری تەمـەڵی و تەوەزەلی و درۆ دەکـات وەهەمیشە چاوەڕوانی پارەیـەك دەكات كەلەلای لابەلاوە یاری‌یەکی بۆی برەخسێ و شتێـك ببـاتــەوە وەئــەو جۆرە کەسانەی کەفێری قومار بوون ئیتر کارو کاسبیان پێ ناکرێ لەکشت و کاڵ و بازرگانی و پیشەو دەست ڕەنگینی کەهەر ئەوانەش مایـەی ئاوەدانی وولاتن چوارەم پارەو پولی بەدەستــەوە ناهێـڵێ (بروانە تەفسیری خاڵ بەرگی دووەم ل ١٢٠ لە هەمــووشت خرابتــریش ئەوەیــە قومارچی کە بردی‌یەوە دەیــەوێ زۆرتــر ببــاتــەوە کە دۆرانــدیشی دەیەوێ تۆڵە بستێنێت ئیتر بەم جۆرە بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت خۆی لەم یاری‌یە رزگار بکات و لە کۆتاییدا خۆی دەفەوتێنێت

**[تێبینی]** قومار کردن گوناهێکی زۆر گەورەیە ئەگەر یەکێك بە یەکێکی تر بڵێت وەرە قومـار بکەین بێ ئەوەی بیکات پێــویستــە کەفــارەت بدات هەروەك پێغمبــەر (د.خ) دەفەرمووێت [مَن قالَ لصاحبه تعالى أقامِرك فليتصدق] ـ رواه البخـاری ـ واتــە هەر کەسێـك هەر برواداریك بە هاوڕێیــەکی خۆی بلێ وەرە قومار بکەین باخێر بکات بۆ ئەوەی ببێتــە کە فارەتی ئەو تاوانە] ئەگەر تەنها بەقسە کردن و یاری‌کردن بڵێت قومار بکەین وە ئەگەر ئەم کردەوە

بکات دەبێت تاوانی چەند گەورە بێت.
سبحان ربك ربِّ العزة عما يصفون و سلام على المرسلين والحمد الله رب العالمين.
بەیارمەتی خوای گەورە لێبوومەوە لەنووسینی بەشی یەکەمی پەرتووکی [تاوانە گەورەکان] ڕێکەوتی کۆچی ١٠/١٠/١٤٠٤ چاوەڕوانی بەشی دووەمی بکەن [إن شاء الله]

**نووسین و ئامادەکردنی**
**عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز**
**ئیمامی گوندی دارەتوو**

## سەرچاوەکانی ئەم پەرتووکە

١ـ قورئانیی پیرۆز
٢ـ تەفسیری ئیمامی رازی [التفسیر الکبیر]
٣ـ تەفسیری ئیمامی قورطبیی [تفسیر جامع الاحکام]
٤ـ تەفسیری ئیمامی ئالوسی [تفسیر سبع المثاني]
٥ـ تەفسیری (واضح) محمد محمود الحجازی
٦ـ تەفسیری (نامی) ملا عبدالکریمی مدرس
٧ـ تەفسیری (خاڵ) شێخ محمدی خاڵ
٨ـ کتاب الزواجر عن اقتراف الکبائر الشیخ ابن حجر الهیتمی المکي.
٩ـ الخطایا في نظر الاسلام تألیف عفیف عبدالفتاح طبارة
١٠ـ کتاب الکبائر تألیف الامام الحافظ المحدث شمس الدین محمد الذهبي.
١١ـ أرشاد العباد الی سبیل الرشاد زین الدین بن عبدالعزیز
١٢ـ روح الدین الاسلامی عفیف عبدالفتاح طبارة
١٣ـ شەریعەتی ئیسلام ملا عبدالکریم المدرس
١٤ـ الترغیب والترهیب للحافظ المنذری ومع حاشیته
١٥ـ تاج الاصول لشیخ علي منصور الناصف
١٦ـ ریاض الصالحین الامام النووي

١٧ـ مذاهب الأربعة عبدالرحمن الجزيرى
١٨ـ كيفاية الأخبار تأليف الأمام تقي الدين الشافعي
١٩ـ السبع الموبقات تأليف الشيخ كاظم كريم
٢٠ـ منهاج الصالحين من احاديث وسنة خاتم الانبياء والمرسلين تأليف عزالدين بليق
٢١ـ فقه السنة تأليف السيد سابق
٢٢ـ منهل الواردين تأليف الدكتور صبحى صالح
٢٣ـ الاتحافات السنية بالأحاديث القدسية الامام عبدالرؤف المناوى
٢٤ـ فيض القدير شرح جامع الصغير تأليف الامام المناوى
٢٥ـ دليل الحيران في الكشف عن أيات القرآن ترتيب الحاج صالح ناظم.

## فەرهەنگۆك

| ووشە | ماناكەی |
|---|---|
| گەواهی | شایەدی |
| ڕواڵەت | مەرایی ـ بەرچاوی |
| سوو | سود ـ الربا |
| ظاهری | رووكەشی |
| رۆوژی | اڵرزق |
| رێباز | مذهب |
| گەشتكار | گەشتیار (مسافر) |
| عوزر | هەنجەت ـ بەڵگە |
| هام وشۆ | هاتوو چۆ |
| نەفرەت | لەعنەت |
| پەند | عیبرەت |
| بێشتیار | عرض ـ تقدیم، اقتراح |
| گیرا | قبول |
| ریسوا | روو رەش |
| گزی | اڵغش |

| | |
|---|---|
| جێگر | خليفه |
| سستەم | ظلم |
| دان پیاهێنان | (قرار) |
| داوێن پیسی | (الزنا) |
| ڕەوا | مشروع/حلال |
| باوەر | ايمان |
| دادگەری | العدالة |
| دوارۆژ | القيامة |
| سامان | المال |
| تاوان ـ گوناه | الخطاية ـ الاثم ـ الذنب |
| ڕوانگە | نظر |
| تێبینی | تنبيه ـ ملاحظة |
| سزا | عذاب |
| واته | يعن المعنى |
| باسێك ـ | .فصل |

## ناوەرۆك

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمدالله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا (محمد) خاتم الانبياء والمرسلين وعلى آله واصحابه ومن تبعهم بأحسان الى يوم الدين**

مرۆڤی زانا ـ وەکو چرایێکە لە تاریکی شەودا کە زانینەکەی بەدەوروپشتی خۆی ئەبەخشێ وەك ئەستێرەیەکی کەشەدار دەچێت کە دەدرەوشێتەوە ئەرکی مامۆستایان و زانایانی ئایینی هەر لە کۆنەوە رێ نمانی کردنی کۆمەڵ بووە لە پێناو فێربوونی کاری چاکەو دوورکەوتنەوە لەهەڵس و کەوتی چەوت و ناپەسند کە بەم چەشنە رازی بوونی پەروەردگار وە دەست دێت بە تایبەتی لەم سەردەمەدا ئەبێ هەموو لایەك دەست برد بکەین بۆ رامالینی ئەم دیاردە نالەبارانەی کە بڵاوو بوونەوەی لە ناو کۆمەڵی کوردەواریماندا کە لە دەست کردنی ناحەزانی ئایینی ئیسلامی پیرۆزە. جا ئەبێ هەموو لایەك ئاگادار بکەینەوە لەم تاوانانەی کە بچوك و گەورەن لێرەدا دەمەوێ پیرۆزبایی خۆم لە مامۆستای بەرێزو خۆشەویست کاك ملا عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز بکەم بەبۆنەی دانانی ئەم کتابە (تاوانە گەورەکان) کە توانیویەتی هاریکاریەکی باش بکات.

لە دەرخستنی هەردوو رووی چاکەو خراپە بۆیەمنیش

بسم الله الرحمن الرحيم

داواکارم خوای گەورە پاداشتی ئەم خزمەتە چاکەی بداتەوەو هەموولایەکمان بکات بە هێزێکی یەك گرتو بەچەکی زانست و زانیاری لەرووی تەوژمی بەرەڵایی و لاسایی بێگانەکان بوەستین وە کۆمەڵێکی پێش کەوتوو خواناس پێك بهێنین ببین بەسەر قافلەی کاروانی زانین لە کۆتاییدا داواکارم خوای گەورە لەکارەساتی رۆژگارو شەری کەسانی لە خوا نەترس بمان پارێزێت. پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموویت «إذا مات الانسان انقطع عمله إلامن ثلاث صدقة جارية او علم ينتفع بِهِ او ولد صالح يدعوله»

**محمد عبدالكريم البرزنجي**
**امام وخطيب جامع آزادى**
**٩/١١/١٩٨٤م اربيل**
**١٦/٢/١٤٠٥هـ**

## بسم الله الرحمن الرحيم

فلله الحمـد جزيلا وكفى بالله وكيلاً ولانرضى دونه بديلاً وصـل الله على سيـدنـا محمد الذي جعله الله لنا دليلاً وأرسله هادياً واوضـع لنا سبيلاً وعلى آله وأصحابه الذين سلكوا ومابدلوا تبديلاً أما بعد فلقد من الله علينا إذ الهم اخانا في النسب الفاضل عبدالرحمن ابن ملا طه ليتشرف بجمع وتأليف كتاب (تاوانه گەورەكان) فقد التمس منى ان اراجعه ولكن كثرة المشاغل حالت دون ذلك وبعد مطالعتي لبعض مؤلفـه من هذا القسم فوجدته مفيداً و مفيد في موضـوعـه ولقد الفيته كتاباً في بابه فريدا من نوعه وكل موضوع منه يصلح للخاصة والعامة ويمكن ان يستعين به الواعظ والمحاضر والخطيب والطالب ويكفيه نفعاً انه تعرض لبيـان اخطار جميع الكبائر وذكر الزواجر وذلك بأسلوب سهل ممتع ومقنع مما التقطه من كتب العلماء الاعلام من سلف الامة وخلفها وله فضل البيان هذا ولتمام النفع انه عازم على القيام بطبع القسم الثاني من الكتاب بعون الله تعـالى وختاماً نبتهل الى الله بالدعاء الصالح له ويحفظه من المخاطر كما نسأل الباري جل ذكره بأن يجعل بلدنا آمناً

مطمئناً ونناشده النصر والتوفيق والسلامة من الفتن ويهلك
كل معتد أثيم حسبنا الله ونعم الوكيل.

**عبدالله ملا طه عزيز**
**امام مسجد قبله خوار /اربيل**
**١٩٨٦/٤/١٥**

(بسم الله الرحمن الرحيم)

الحمد الله الذي يوفق الصالحين من المؤمنين لخدمة الاسـلام والمسلمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد شمس الهداية وعلى آله وصحبه ومن سار على دربه الى يوم الدين.

وبعد : فان أخانا في الاسلام الاستاذ ملا عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز.

من الذين صدقوا ما عاهدو الله عليه وأخلصوا نيتهم لله سبحانه وتعالى وقد حثه إيمانه على أن يقوم بتأليف كتاب (تاوانه گەورەكان) وقد اطلعت على جزء منه فألفيته كتاباً وافياً بالغرض الذي من اجله صنف في اسلوب سهل وعبارة غاية في الوضوح سائلاً المولى العلي القدير أن يجزل جزائه ويثيبـه على عمله وأن يوفقـه للسـير على طريق السلف الصـالح من علمـاء هذه الامـة وأن يجـعله من الذين يستمعون القول فيتبعون أحسنه.

**محمد ملا احمد الامام**

**امام وخطيب الجامع الكبير في عقرة**

**ومفتش المساجد في قضاء عقرة**

**٢٢ / صفر / ١٤٠٥ هـ**

**١٦/ تشرين الثاني / ١٩٨٥**

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله الذي جعل علماء الدين مناراً لاعلاء كلمة الله الصـلاة والسلام على من بعث متمماً لمكارم الاخلاق محمد المصطفى صلواة الله وسلامه وعلى آله واصحابه الابـرار الشرفـاء فبعـد اطلاعي على **مانمقه الفاضل** ملا عبدالرحمن ملا طه الدزهيي من تفسيرات وتراجم لبعض الايات القرآنية والاحاديث النبوية كلا حسب مضامينها وسماها ب (تاوانه گەورەكان) كان عند يقيني انه اصاب الواقع كأنها نقط وضعت على الاحرف من سلاسة ألفاظها وحلاوة معانيها وجذبه طرائقها حيث لم يأل جهداً لتحصل نفائسها وكان حقاً مصداق قوله (ص)(من كان لله كان الله له) فالله أرجو ان يجعل سعيه مشكوراً ويكثر من أمثاله في هذا العصر حيث قد قل نظرائـه فالنـاس يسعون لجلب الحطام الفانية أماهو (والله يشهد) فيسعى للحصول على ذخيرة الاخرة والخلف الفاضلة كما هو أهل لها ويجعل الله قدوة لمعاصريه في خدمة هذا الدين الحنيف انه سميع مجيب.

**الناظر في كتاب (تاوانه گەورەكان)**
**نورى شيخ يحيى الاتروشي مسكناً والبريفكاني نسباً**
**امام وخطيب جامع العشائر السبعة (بردەرش)**
**٧صفر/ ١٤٠٥ هـ**

م/١٩٨٤/١١/١

## کۆتایی

زۆر سوپاسی [شێخ بشیر عبدالرحمن] اتروشی دەکەم کەیارمەتی داوم بۆ چاپ کردنی ئەم (کیتابە)
زۆر سوپاسی (مامۆستا) سعید ملا یحییٰ دەکەم زۆر سوپاسی بەرێزان مامۆستا کمال دۆلپەموویی و (مظفر) سید عبدالله سید صالح بەرزنجەیی دەکەم کە بۆمیان پاك نووس کرد ئەم [پەرتوکە] خوای گەورە پادشتیان بداتەوە.
زۆر سوپاسی کرێکارانی چاپخانەی اوفیت نالي دەکەم لە هەولێر خوا وێنەیان زۆر کات چاوەروانی بەشی دووەمی [تاوانەگەورەکان] بکەن (ان شاءالله) بە زوو ترین کات چاپی دەکەم



خەیاڵ نیە لەسەر پەرە تومارم کرد
ئەمە وێنە لە لاتان بۆ کەبار کرد
دلم پڕ بوو لە بۆنی خۆش لە سەروینە
پێ نوس رەشتی گەو هەری جوان دەڵێ خوێنە

له بلاوكراوه‌كانی كتێبخانه‌ی (الغزالي) له هه‌ولێر

# كبائر الذنوب في نظر الاسلام

كتابه واعداد
عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز

السعر ( ٢ ) دينار

رقم الايداع في دار الكتب والوثائق( ١٤١٠ )لسنة ١٩٨٩

مطبعة اوفسيت نالي/اربيل